# لەبنیدەریا ... مرواری

حوسێن مستەفا

لە بنی دەریا...مرواری

نووسینی: حوسێن مستەفا

• تای تەرازووی کێش تا گرانتر بێ
دەچێتە خوارێ ..
چەشنی مرواری ، لە بنی دەریا ..

• عاشقێ لە تاریکی و تەنیاییدا چاوەڕێی
مەعشوقەکەی بوو ، یەکێ سەرکۆنەی کرد و
پێی گوت : مەگەر دێوانەی ، دەنا بەو
تاریکستانە کێ دەتبینێ ؟ ئەگەر داخوازی
بەرچاوکەوتنی ، برۆ چرایەك هەلکە و ئەو
ناوە رووناك بکەوە تا دەرکەوی .. عاشق
لە وەلآمدا گوتی : چرام بۆ چییە کاتێك من
چاوەڕێی چرام و هەرگا دەرکەوێ ئەوناوە
دەکاتە چراخان و لە شەوقی خۆیدا
دەمدۆزێتەوە ..

• لە گڕ گەرمتر ئەو خورپەی دلم، سەردەمی لاوی..
لە بەفر ساردتر ئەو ترپەی دلم، ئێستا کە پیرم..
ئەودەم دێوانە و هۆش لەدەست چوو بووم
بەدەم عیشقەوە .. ئێستاکە ژیرم لەپای
ئەزموون و پەند و مەشقەوە .. خۆزیا کە لاو بووم
هۆشم هەبووایە ، تا نەخەوتمایە ..
لە پیریەتیشدا هێزم هەبووایە، تا نەکەوتمایە ..



حوسێن مستەفا



پێناسەی کتێب

ناوی کتێب:  لە بنی دەریا .. مرواری

بــابــەت: ئەندێشە

نووسینی: حوسێن مستەفا

پێشەکی: نوری بێخاڵی

دیزاینی ناوەوە: زاگرۆس ڕێباز

بەرگ: تەیب موعتەسم

ســـاڵو شوێنی چاپ: هەولێر ٢٠١٢

نـــرخی: (٣٥٠٠ ) دینار

تیـــراژ: ١٠٠٠ دانە

ژمارەی سپاردن: بەڕێوبەرایەتی گشتی کتێبخانەکان

ژمارەی  سپاردنی (      ) ساڵی (٢٠١٢)ی پێدراوە




ئامادەین بۆ چاپ و بلاوکردنەوەی

هەموو جۆرە بلاوکراوە و بەرتووکێکی نوسەران

**پرۆژەی چاپکردنی بەرهەمی نووسەرانی سۆران**

**پێشکەشە:**

**خوێنەری ئازیز:**

**ئەم توێشووە پڕ لە هێشووی ئەندێشەیەم دیارییەکی تایبەتە و پێشکەشە بە تۆ.**

**دەزانم کە تۆ شایانی دیاری لەوە بەنرختری، بەڵام ئەمن هەر ئەوەم لەدەست دێ.**

**لێم وەرگرە، بەدڵت بوو دوعام بۆ بکە پەرێزی داهاتووم بە بڕشت ترو خەلە و خەرمانەم بە بەرەکەت بێ.**

**بەدڵت نەبوو، هەمدیسان دوعام بۆ بکە پەرێزی داهاتووم بە بڕشت ترو خەلە و خەرمانەم بە بەرەکەت بێ...**

زۆر بە کورتی:

## بەر لە ئەندێشـــەکان، ئەم چەند دێرە بخوێنیـــەوە چ دەبێ؟!

زۆر سەرت بە پێشەکی ناهێشێنم، ئەمن بایی ئەوە سەرم هێشاوە.. ئەمە بۆ خۆی پوختەکەیە، بگرە پێشەکییەکە لە ئەزموونی ئەو تەمەنە کورتەی درەنگ هات و زوو تێدەپەڕێ.. کەمی جوانی دی و دزێویش زۆر.. هەروایە...

کەممان راستین، بەڵام کاممان کەمترین خواری هەبێ ئەو راستترینمانە.. بۆ بینینی خوارییەکانیش دەبێ ئەو نەفسە نزمە لەو کەلی شەیتانە داگرین، تا راستەڕێ بێت...

خۆتان سەرپشك و دۆستی دەستگر بن، ئەم هێشووانەی لەم توێشووەدا بۆم چنیون، ئەگەر گەییون بە نۆشتان بێ..ئەگەر پەسیرەو کاڕك و فەریکە و تفتن، بهێڵن ئەوانیش سەردەمێك پێ دەگەن.. هەموویشتان بە گەروودا داناچێ و

بەدڵتان نابێ، چونکە هەرکەسە و کوڵێ باری لەسەر شانە و هەر بارەو توێشووی خۆی تێدایە و هێشووی هەر توێشووە تام و بۆی خۆی هەیە..ئەمن ئەوەم وێیە و ئەتۆش هی دیکە، چ قەیدی!..گرنگ هەردووکمان، هەمووومان، توێشووی پڕ لە هێشوومان وێبێ .

تۆش وەکو من لەم هێشووانە شەریکە بەشی..کەوابوو وێڕای چنینی ئەمانە، تۆش دەستچنێکی ئەوانی خۆتی بەسەر وەنێ، چ لەڕێی خودا، یان لەڕێی خەڵك.. هەرنەبێ بۆ ئاسوودەیی دڵ و دەروونی خۆت .

خوێنەری بەڕێز ئەو ریزە خالآنەی رووبەڕووی ئەندێشەکان داندراون پەرێزی تۆیە، تا بۆ هەمان ئەندێشە دیدگا و ئەزموونی خۆت یاداشت بکەی، ئەمەش بۆ بەشداری هەمووان و پێکەوە کامڵ کردنی ئەم کتێبەیە، کە پێموایە هیچ نەبێ ئەو بەشدارییپێکردنەی تۆی ئازیز و خوێنەرانی دیکەی قەدرگران، شێوازی نوێی نووسینە و کارێکی هاوبەش و

دەستەجەمعییە.. کاری دەستەجەمعییش بەرهەمی بەپێزتر و پەرێزی خاوێنترە..

حوسێن مستەفا

رواندز, نیسانی ٢٠١٢

پێشەکی:

## "ناتوانرێ حیکمەت فێری کەس بکرێ"

ڕەنگە بۆ من تۆزێك سەخت بێت شتێك دەربارەی ئەو گەنجینەیەی ئەندێشە و ئەزموونەکانی نووسەر بنووسم، ئەویش لەبەر دوو هۆکار، یەکێکیان دەرقەت نەهاتنی زمانی ڕەوان و پاراوی ئەندێشەکان، کە پێویست دەکات بە زمانێکەوە لە بارەیانەوە بدوێم هەرنا لەو ئاستە دابێ، کە شایستەی خودی زمانی ئەندێشەکان بێت. دووەمیان لەبەر ئەوەی نووسەر ڕۆژگارێك پێشەنگ و مامۆستای من و زۆرێك لە ئێمەمانانی دەڤەرەکە بووە لە باری ڕۆشنبیری، بە جۆرێك زاکیرەی تاریکی خوێندنەوەمان بە چرای پەرتوکخانەی ئەوان ڕۆشن بۆتەوە و زمانی نووسینمان لەبەر هێشووی بەرسیلەی ماڵی کتێبەکانی ئەودا تامی گرتووە و وەگۆ کەوتووە، بەڵام کە ڕووی تێنام قسەیەك دەربارەی ئەو ئەندێشانە بکەم، هێندەی شەرمندەیی، هەستی نمەك حەرامی دایگرتم، ئەگەر نەدەمە

بەرخۆم و لایەك لە چەند دیوێکی ئەو ئەندێشانە نەکەمەوە و بارتەقای ئەو شارەزاییە ساکار و سەرەتاییەی لەم رووەوە هەمە، شەن و کەوی هەندێ دیوی روخسار و ناوەڕۆکیان نەکەم.

(لە بنی دەریا... مرواری)، یان هەر ناوێك کە ئێوەی خوێنەر بۆ ئەو رستە مرواریە رەنگین لە روخسار و سەنگین لە ناوەڕۆکانە بە شیاوی دەبینن، بۆ من یەکەم و دوا ئەزموونی خوێندنەوە نەبووە و نابێت، چونکە لە دەمێکی زووەوە مێشکی خۆم لەبەر رۆشنایی چرای پەند و حیکمەت و ئەندێشەی (کتێبەکانی پێش فەلسەفە – حیکمەتی چینی) و (پەندەکانی حەزرەتی سولەیمان) و (فیهی ما فیهی مەولانا)و (حەکیمانەی پاولۆ کۆیلیۆ) و (سۆفیگەری کازانتزاکیس) و وتەگەلی ناوداران و بیرمەندان و زۆر پەرتووکی تر زاخاو داوەو تا ئەوپەڕی چێژم لە خوێندنەوەیان وەرگرتووە و پێموایە ئەو جۆرە پەرتووکانە و هاوشێوەکانیان، ئەزموون گەلێکی دەوڵەمەند و گرنگن و شایستەی خوێندنەوەن.

ئەوەی تا ئێستا لە نووسین و شێوازی دارشتن و پەیامی ئەم چەشنە ئەندێشانە حاڵی بووبم، ئەوەیە کە سروشتی ئەم نووسینانە پێویستی بە بیرتیژی و کورتبڕی و سادەیی لە زمان و قووڵ لە مانا و بە شێوەیەکی گشتی ئەگەر بە هەڵەدا نەچووبم، پێویستییان بە باڵادەستی لە هونەرەکانی رەوانبێژیدا هەیە، کە بە بۆچوونی من کەم تا زۆر نووسەر توانیویەتی بەسەر ئەو سروشتی نووسینە زاڵ بێت و خەسڵەت و تایبەتمەندییەکانی لەم ئەندێشانەیدا بەرجەستە بکات. ئەوە ئەگەرچی رەنگە لە هەندێ شوێن کورتی هێنابێت، یان تەواو نەیپێکابێ، یاخود لە هەندێکیان ئەوەندە سادە بووبێتەوە، کە پێویست نەکا لەم پەرتووکە شوێنیان بکرێتەوە.

لایەنێکی دیکەی بایەخ و بەهای ئەم شێوە نووسینانە لەوێدایە، کە مرۆڤ ناچار بە رامان و قووڵبوونەوەی زۆر دەکەن. بە مانایەکی تر بەردەوام لەگەڵ خۆیاندا پانتاییەکی فراوان بۆ گومان و پرسیارەکانی خوێنەر دەکەنەوە، کارێکی نوێش کە نووسەر لەم ئەندێشانەیدا کردوویەتی و جێی دەستخۆشییە،

ئەو پەراوێز و پانتاییە خاڵییانەن، کە دوای نووسینەوەی هەر ئەندێشەیەك بۆ سەرنجی خوێنەرانی جێهێشووە، بۆ ئەوەی راوبۆچوونی خۆیانیان تیادا دەربڕن. ئەمەش بەو مانایە دێت، کە لەلایەك ئەم ئەزموونەی نووسەر و ئەندێشەکانی پڕۆژەیەکی بەردەوام کراوەیە و بەرهەمێکە لە ئەمڕۆ و ئاییندەشدا خوێنەران دەتوانن لە نووسینەوەو داڕشتنەوەو راستکردنەوەو فراوانکردنیدا بەشداربن، لەلایەکەی تریش ئاماژەیەکە بۆ هەستکردن بە بەرپرسیارێتی نووسەر لە ئاست ئەویترو رێزگرتن لە جیاوازی.

دیوێکی دیکەی بەهاداری ئەم ئەندێشانە لەو زمانە کوردییە پاراو و شیرینە دایە، کە پێی نووسراونەتەوە. لەم رووەوە زێدەڕۆییمان نەکردووە ئەگەر بڵێین کاتێ بەشێکی زۆر لەو ئەندێشانە دەخوێنینەوە، یەکڕاست خەیاڵ و بیرەوەریمان دەچێتەوە سەر شێوازو زمانی شیرین و پاراوی نووسینەکانی (هەژار و هێمن و زەبیحی و مەلا شوکر و مەسعود موحەمەد...)، ئەمەش گەواهی ئەو راستییەیە کە نووسەر

خاوەن پاشخانێکی دەوڵەمەندی ڕۆشنبیری و مەلەوانێکی باشی نێو شەپۆڵەکانی زمانی دایکییەتی، بە تایبەتی ئەگەر ئەو خوێنەرەی پێشتر ئاشنای نووسینە وێژەیی و ڕۆژنامەنووسییەکانی ئەو پیاوە بێت، باشتر لەو ڕاستییە نزیک دەبێتەوە. بەو پێیەی هێند ناسك و بە زمانێکی کوردی شیرین شتەکانی دەنووسێ، مرۆ بە تامەزرۆییەوە دەیانخوێنێتەوە.

لایەنێکی تری سەرنجڕاکێش لە هەندێ لەو ئەندێشانەدا بوونی ریتم و مۆسیقای شیعرییە، کە لە باری نووسین و داڕشتنەوەیاندا بۆن و بەرامەی بنەما و ڕێساکانی شیعری کلاسیکی لە باری کێش و سەروا پێوە دەکرێ، دیارە ئەم شێوازە نووسینەش لە دوو لایەنەوە بۆ خوێنەر گرنگە، لەلایەك بە ئاسانی دەگەنە گوێچکەی و لە یادەروەریدا دەمێننەوە، لەلایەکی تریش چێژێکی هاوچەشنی خوێندنەوەی دەقێکی شیعریان لێوەردەگرێ.

وەکوتر بەبۆچوونی من و بە گوێرەی ئاشنایەتی و نزیکیم لە نووسەر وەك هاوڕێ و هاوکارێك، هەست دەکرێ زۆربەی ئەندێشەکانی لە ژێر کاریگەری باوەڕی ئایینی و ئەو یەقینە ئیمانییەوە نووسیون، کە پێیەوە پابەندە. بۆیە ئاساییە بە ئاسانی پەی بە شوێنەوار و ڕەنگدانەوەی ناوەڕۆکی ئایەتە قورئانییەکان و فەرموودەکانی پێغەمبەری ئیسلام و جار جارەش کاریگەری ئەندێشەکانی (مەولانا)و هەندێ لە عاریف و شێخانی تەریقەت و تەنانەت بیرمەند و حەکیمانیش بەسەر ئەندێشەکانی نووسەرەوە ببەین، کە ئەمەش حاڵەتێکی سروشتییە و هیچ نووسینێك لە ئایندە و ئێستا و تەنانەت سبەیش نادۆزینەوە، کە ڕەنگدانەوەی ئەزموونەکانی پێش خۆی بەسەرەوە نەبێ، ئەوەی واش دەکات ئەو ئەزموونانە بە کاریگەری و کارتێکەری لە یەکتر جیا بکەینەوە، جیاوازی زمانی نووسین و شێوازی داڕشتن و دونیابینی نووسەرەکانە بۆ خوێندنەوەی شتەکان. لە ڕاستیشدا ئەگەر ئەو کاریگەرییە

نەبووایە، ئەوا بۆ نموونە وەك دەڵێن تەنها كەسێك دیوانێكی دەنووسی و قوفڵی لە دەرگای نووسینەوەی شیعر دەدا.

هەروەها شتێك كە لەم چەشنە نووسینانەدا جێی سەرنجە، وا دەردەكەون كە بە شێوەیەكی رەها نووسراین و مەبەستی نووسەرەكانیان باوەڕپێهێنانی بێ چەند و چوونی خوێنەر بێت بە بۆچوونەكانیان، كە بە بۆچوونی ئێمە ئەم جۆرە تێگەیشتنە بۆ ناوەڕۆك و مانا و مەبەستی ئەندێشە و حیكمەتەكان هەڵەیە، چونكە جگە لەوەی ئەوان ئەزموونەكانی خۆیان دەنووسنەوە، هاوكاتیش ئەندێشەكان تەنها لە باری روخسار و زمانی داڕشتندا بەم شێوەیە خۆیان نمایش دەكەن. بۆ نموونە ئەم نووسینانە لە باری روخساردا زیاتر وەك وەعزو تەلقین و ئامۆژگاری خۆیان دەنوێنن، بەڵام ئەگەر لەباری لۆژیكو مەبەست و ناوەڕۆكەوە لێیان وردبینەوە، رێك پێچەوانەی ئەو بۆچوونەمان دەستگیر دەبێت، بەو پێیەی زیاتر راهێنانێكی هزری و مەعنەوی و دەروونین بۆ خوێنەر و بواری سەرپشك كردنی بۆ ماوەتەوە، تا ئاراستە و رێچكەی ژیان و

بیرکردنەوەی خۆی دیاری بکات. نووسەری ئەم ئەندێشانە لە هەوڵێکی جوان و ناوازەدا، کاری بۆ ئەوە کردووە ئەو بەدحاڵی بوونەی خوێنەریش بڕەوێنێتەوەو لەوە دڵنیای بکاتەوە، کە ڕەهاگەرانە بیری نەکردۆتەوەو نەینووسیون، وەك پێشتریش ئاماژەمان پێکرد، بەجێهێشتنی ئەو پەراوێزانەی بەرامبەر ئەندێشەکان بەڵگەن لەسەر ئەوەی، کە نووسەر مەبەستی نییە بەبێ چەند و چوون بکەوینە ژێر باری یەقین و جەبری بۆچوونەکانی، لەو دیدگایەی کە ئەو پەراوێزە خاڵییانە پانتاییەکی کراوەن، بۆ ئەوەی خوێنەر جیاواز بنووسێ و جیاوازیش بیر بکاتەوە.

ئەوەی لەم ئەندێشانەدا بۆ من زۆر گرنگە قسەی لە بارەوە بکەم، ئەوەیە کە زۆربەی ئەندێشەکان بە تەنها بەرهەمی خوێندنەوەی بەردەوام و قووڵبوونەوەو تێڕامانی نووسەر نین لە هەلومەرجەکانی ژیان و دەوروبەر و دیاردە و دەرکەوتەکانی، بەڵکو زۆربەی هەرە زۆری ئەندێشەکان (بە حوکمی ئاشنایەتیم بە ژیانی نووسەر) زادەی خودی

ئەزموونەکانی نووسەر و ژیانی پڕ سەفت و سوێ و چەرمەسەری و هەوراز و لێژی خۆی و خێزانەکەیەتی. بە مانایەکی تر ڕەنگە خوێنەر کە شارەزا و ئاشنای ژیان و ژینگەی نووسەر نەبێت، بە پەلە و لە تاریکییەوە حوکم بەسەر موڵکداری ئەندێشەکانی بدات و پێی وابێت کۆپی ئەزموونەکانی پێش خۆیەتی، لە کاتێکدا ڕاستی ژیانی ئەو، سەرچاوەی ئەندێشەکانییەتی. نەك هەر ئەوە، بەڵکو خودی ئیمان و یەقینی نووسەر لە باری ئایینی، باوەڕێك نییە ریکارانە و بۆ دونیا، یان بەرهەمی تەوژمی ئیسلامگەری سیاسی بێت، چونکە سەرەڕای ئەو هەڵچوون و داچوونە فیکری و دڵەڕاوکێ و گومانە سیاسییانەی ئەزموونی ژیانی خۆی، بەلآم تا ئەوپەڕی ڕاستگۆیی هەم بە ئەندێشەکانی و هەمیش بە ئیمان و باوەڕەکەیەوە دەبینرێ.

کە دەڵێین ئەندێشەکان لە ئەزموونی ژیانی خۆیەوە سەرچاوەیان گرتووە، چونکە ئەو کوڕی پیاوێکی قارەمان و جوامێر و خانەدانە، کە لە زوویێکەوە کۆشێ منداڵی بە بێنازی

بەسەر دایکێکی کۆست کەوتوو، بەڵام میهرەبان و خاوەنی عیززەتی نەفس و شێرە ژن بەجێهێشت. ئەو لە رۆژگارێکدا باوکی شەهید بوو، کە جگە لەوەی ئومێدی شۆڕش و سەرکەوتن رۆژ دوای رۆژ لە کزی دابوو، کەچی لە بەرامبەردا چاوی تیژی سیخوڕ و پیاوخراپ و بەدکار و کاسەلێسان بۆ نیگابانی بەسەر ماڵ و منداڵی شەهید و تێکۆشەران، تیژ و تیژتر دەبوو و تا دەهات چنگ و چڕنووکی بێبەزەییان توندترو خوێنی خیانەتکارییان زیاتر رژابووە چاوانەوە. نووسەر لەگەڵ ئەندامانی خێزانەکەی، لە باوکیانەوە تەنها میراتی هەڵوێست و مێرخاسی و کوردبوونیان بۆ بەجێما، ئەگینا لە باری ژیان و گوزەراندا، ئێستاشی لەگەڵ دابێت، کەس ئیرەیی و خۆزگە بە ژیانیان نابا. رەنگە دیوی هەرە سەرنجڕاکێش لەم ئەندێشانەیدا، بەهادانی نووسەر بێت بۆ بوون و بەها و کەسایەتی ژن، کە بە بڕوای ئێمە ئەمەش سەرچاوە لەو ئەزموونە تاڵەی ژیان و میهر و سۆزی دایکییەوە دەگرێ، کە هەمیشەی نەوای دڵنەوایی و ئاگردانی ئۆقرە و

سێبەری پشوویان بووە.. دایکێك نە رۆژێك سواڵی لە دەرگای بەزەیی کەس کرد و نە بواری جگەرگۆشەکانیشیدا لەژێر داری خۆزیا و بریا و تەمبەڵی و تەوەزەلیدا ژیان بگوزەرێنن و نە فێریشی کردن (نەزان پەرستی بۆ نان!) بکەنە دروشمی ژیان..دایکێك بە دەستێك پرچی ژانەکانی شانە دەکردن و بە دەستەکەی تریش مەردانە پەروەردە و گۆشی کردن.

دواجار، نازانم کێییە کە باس لە چییەتی و ماهییەتی حیکمەت دەکات، بەڵام پشتڕاستم لەوەی کە دەڵێ "ناتوانرێ حیکمەت فێری کەس بکرێ"، واتە حیکمەت هاوکێشەیەکی ماتماتیکی نییە فێری بین و تێکستێکی شیعریش نییە ئەزبەری بکەین، بەڵکو حیکمەت بەرهەمی موتالاّ و ئەزموون و راهاتن لەگەڵ خۆشی و ناخۆشییەکانی ژیان و ویست و ئیرادەیە بۆ بە مرۆڤ بوون و خاوەن دەرکەوتن لە خودو بەها بەرزە ژیان و مرۆڤدۆستییەکان. ئەوەی بەردەستیشتان مروارییەکی بریسکەدارە لە دەریای ئەزموونەکانی نووسەر و دوور نییە زۆربەمان سوودی لێوەربگرین، بە تایبەتی ئەگەر

بزانین کە گرنگ نییە نووسەرێک چەند کتێبی نووسیوە و دەنووسێ، بەڵکو گرنگ ئەوەیە چی دەنووسێ و دەرخواردی خوێنەری دەدات، کە بە بۆچوونی ئێمە ناوڕۆک و پەیامی ئەو ئەندێشانە ئەوە دێنن مرۆڤ کاتێک بۆ خوێندنەوە و تێڕامانیان تەرخان بکات.

لەگەڵ رێز و خۆشەویستیم...

نوری بێخاڵی

کوردستان/ رواندز

١٦/ ٤ / ٢٠١٢ زایینی

بەرامبەر ٢٧ی نەورۆزی ٢٧١٢ی کوردی

* بــــەناوی پـــــەروەرێنم دەســــت پێدەکەمو بە ئەسپایی ئەندێشەکانم دەدوێنم. ویستی لەسەربێ رووناکی دەبیـــنن و بــــە روونــــاکی ئــــەو دەدرەوشــێنەوە. نەیویســـت چـــش، ئێمــە چــین کــە شــتێکمان بــوێ ئــەو نەیویستبێ؟ حاشا وەکەللا...

..بەناوی نوور...

* گـــوتی: ئــــەو بــــەو گەورەییــــەی خۆیەوە بچووکێکی وەك من دەبینێ، بچـووکێکی وەك مـن چییە ئـەو بـەو گەورەییــە نــەبینێ! گــوتم: ئــەوە چ کوفرێکە دەیکەی! بەو بچووکییەوە چـــۆن خـــۆت لەگـــەڵ ئـــەودا لـــە کەوانەیەکدا داوێی؟ گوتی: ئاتاج بە

بەخشینم، ئەو ناماقوولّییەم هەربۆیە
کرد تا بیانووی بەخشینم هەبێ.
دەمبەخشێ، چونکە ئەو بۆ ئەوە
منی لە پەنای خۆی داناوە.

* ئەو گوتی: نەزان هەڵپەیانە بچنە
سەری ژوور و زانا لەخوارێ دەمێنن.
ئەم گوتی: لە بنی دەریا مرواری بە
کپی کەوتوون، بەڵام لە سەنگ و
بەها نەکەوتوون. لە سەران شەماڵ
چڵ و پۆپەی دار گەر دەبزوێنێ،
بەڵام رەشەبا لک و کەدەکەی
تێکدەشکێنێ.

* براکان یوسفیان وەبن پێیانیان
ناو خستیانە بنی بیر، کەچی ئەو

**لەسەر سەریانەوە دەرکەوتەوە، چییان بۆ مایەوە؟ بە کۆ هاتن و پێیەکانی ئەویان راmoووسی تا بیانبەخشێ! نەزان بوون، نەیانزانی ئەو هەر ئەوێ رۆژێ ئەوانی بەخشیبوو کە رقیان لێی هەڵگرت و وەبن پێیانیان نا!**

*** چیاکان چەندە گەورەو بەرزو عاسێش بن ناتوانن رێ لە هەڵهاتنی خۆر بگرن.**

*** مرواری کە هێندە بە نرخ و بەهایە، قابیل بە گەردنی یاری نازەنینە. خوانەکا بکەوێتە دەستی بیرکۆڵ، دەنا ماتانێی پێ ئەکات.**

* لەگـەڵ هـاتنم چـاکه و خراپـه لـه ناخمایه، رۆژێك دێت یـەکیان ئـەوی دی ئەبــەزێنیٚو ئــەو رۆژه کۆتــایی منـه، چـونکه مـن جگـه لـه ململانێی ئـەو دووانــه چـیدیکه نـیم. ئـەوەی گرنگـــه لایەنگیرییەکەمـــه بـــۆ بەرەیەکیان.

* قابیل کـه هـابیلی کوشت بیـانووی بـەجوانی خوشـکەکەی گـرت. پاسـاو هەرچــەنده جــوان بــوو حەقیقــەتی نیـازی نەشـاردەوه، کـه تـاوان بـوو. بۆیــه شــەڕانگێزی بــوو بــه میراتــی براکــان، بــەڵام قوربــانی ســەرەکی خوشـــــکەکان بـــــوون. ئـــــەوه راستەقینەیەکه تـا ئـەمڕۆ نـه براکـان

دەتــوانن بــە مــوو لێــی لادەن، نــە خوشکان دەتوانن خۆی لێ پەنا کەن. کاری دین و هزر و ژیاریش تا ئێستا نـــەیانتوانیوە ئـــەو میراتـــە هەڵبوەشێننەوە.

* بــەرئاگردان هەرچــەندە گەرمــە و حەکایــەتو گاڵتەوگــەپی خۆشیشــی تێــدا دەگــوترێ، لەبنەڕەتــدا دەردی سەرمایە ئەوێی گەرم کردووە.

* من بە ڕۆژووم و ڕەنگە نەزانی کە چــەندە تینــووم. دڵنیــات دەکــەم تــا خــۆری عەدالــەت نــەبینم، نــە جــەژنم هەیــە و نــە تینووێتیەکــە و ڕۆژووم دەشـــکینم. تینـــووی عەدالـــەت

تینووترینـــە، چـــونکە گـــیرۆدەی
سوێرایی ژینە.

* باوک (دایك) بـە هـەڵهاتنی هـەتاوی
منداڵەکـــەی دڵخۆشـــە، ئەگەرچـــی
دەزانێ کە ئەوە نیشانەی ئاوابوونی
هـەتاوی ئـەوە. ئـەو پیر دەبێت و بـە
کــزی دەڕوا، جــێ بــۆ ئــەوە چــۆڵ
دەکات کە تازە و پڕشنگدارە. هێشتا
هەر دایکـە (باوکـە) کـە زەردەخەنـەی
دێتــە ســەر لێــو، هــەر منداڵــە کــە
نــووزەو گریـــەی دێـــت. ئەمەیـــە
سوننەت، سوننەتی ژیان.

* ئەگەر گوێت لە پارچەیەك نەی بوو
پێتوانــەبێ ئاوازەکــەی زۆر خۆشــە،

رەنگە ئەوە ئاه و نالەی ژەنیارەکەی
بێ.

* ئەو رۆژەی رۆژی تۆڵە هات و
ناپاک وەژێر مێرخاسان کەوت، لە
مێرخاسی بوو کە ناپاکی بەخشی
نەك لە ناپاکی. بۆ ئەوە بوو ئەو
خەسڵەتەکانی ئەم وەرگرێ، نەك
ئەم.

* بۆ راگرتنی دڵی ستەمکار،
مەڕەنجێنە لەخۆت دڵی وەستاکار.
ئەگەر داماوت کەوتنە بن دەستی،
لەبیرت نەچێ خۆت داماوێکی لای
دەسەڵاتدار.

* نــەخۆش لــەتاو ئــازاری لــەش دەنــاڵێنیٚ و لەشســاغ کــەیف بــە بەدەنیـەوە دەکات، خۆڵ خەبەرێکی لەم و لـەو نییـە. هێنـدەی لەسـەرە بـە مشتێك هـەم چاویان تێر بکا و هـەم لەشیان پڕ.

* پیریــش وەك منــداڵیی پــڕە لــە سەراسـیمەیی. ئـەو لـە رازی ژیـان ناگات، ئەم لە رازی مردن.

* نیوەشەوێکی تاریك دزێك پارێزی بردە کۆزی مـەڕدارێك، سـەگەل لێـی وەئاگا هاتن و رەتاندیان. لـە جیاتی دەم و ددانی بە دونگ چەور بیٚ، کە

گەییە فەراحنایی دیتی پاشەڵی
چەورە.

* ژیان تا سەخت بێت پڕ
ئەزموونترە. ناسۆر و رەنج وەك
شوونی دڵۆپەی ئاو بەسەر بەردی
ناو ئەشکەوتی تاریك دەمێننەوە،
هەرچەندە کە ئەو بەردە لە
ئەشکەوتی تاریکدایە، ئەو
دڵۆپەیەش لەو تاریکیەدا رژاوەتە
سەری، بەڵام هەر کەس بیبینێ
دەزانێ دڵۆپەی ئاو کونی کردووە،
جا با لە بنی ئەشکەوتیشدا بووبێ.

* هاودەمێکی خۆشەویستت هەبێ
هەرچی بەنرخە لە قەبەڵی داوێ.

ئەمیش هەروایکرد، بەر لەهەر شت
جێنشینێکی کردە هاودەمی خۆی،
ئەوسا دونیا و گەردوونی لە قەبەڵ
نا.

* رۆژێ چەند جاران پەیمان
دەبەستی و ورد و خاشی دەکەی؟
بۆ لێی بێ ئاگای! ئەوە نییە کە
کەسێك دەبینی سڵاوی لێ دەکەی!
سڵاو واتە پەیمان بێ لەگەڵتا پاكمو
لێم دڵنیابە. سڵاو ئەمانەتە، ئەگەر
کردت بە تەواوی برۆ ژێر باری.

* هونەر لەوەدا نییە گوڵ لە بەرۆکی
یار بدەی، لەوەدایە گوللە بە سنگی
نەیارەوە نەنێی. ئەگەر دەتەوێ

بـــەمیان خۆشەویســـتی بڕوێنـــی،
بەویان رق و کینە بڕەوێنەوە.

* کـەس قوفـڵ لــە دەرگایــەك نـادا
ژوورەوەی چـۆڵ بێـت. ئەگـەر رێـی
چـوونە دڵێکـت نـەبوو لێـی مـەگرە،
رەنگـە بـەر لــە تـۆ عـەودالێك پـڕی
کردبێ. دڵگران مەبە هێشتا دەرگای
دی هەنە کە گارە نەدراون.

*ئـەو لەبەرخۆیـەوە دەیگـوت: ئـای
مرۆڤ چەند سەراسیمە و پەرێشانی!
بـــەو ژاوەژاوەی رۆژ دەرەنجبـــەری
دای و بــەو ئــارامی و خامۆشــییەی
شـەو دەشـیرین خـەودا! ئـەم گـوتی:
ئاخر رەنجیش سەرباری تێن، تین و

**رووناکیشی دەوێ، دەنا دەتاریکیدا هەر پەلەقاژەیە و هەم بێهوودەیی.**

*** گوتی: تۆ لەبەر سێبەری مەولانا نەبێ هەڵدەقرچێی! گوتم: کاری سێبەر هەر ئەوەیە پێش بە هەڵقرچان بگرێ. چ مەرهەمەت و دڵنەواییەکە ئەو سێبەرەی مەولانا، کە لەپاڵ چین چین سێبەری فێنکتردا دەشنێتەوە.**

*** مردن تەلەسمی سەر گەنجینەی ژیانە، هەرگا بەسەری هەڵبووی گەنجینەکەت بەتاڵ دەبێ!**

*گوتیان: حوسێن هەر تۆ و بەس.
گوتی : کەوابوو ڕێگا دوورەکە
نزیکە. هەروابوو، کە هات هەر
خۆی و ئال و بەیتەکەی بوو، بە
خەیاڵی دوورەوە هات و نزیک
گەیشت. ئەو، ئەو ڕێگا نزیکەی پێ
دوور بوو، کەچی ڕێگا هەرە
دوورەکەیان بۆ نزیک کردەوە. وەلێ
ئەو بەلەز ڕۆیشت و ئەوان بەجێمان.
تا ئێستاش هەر بەدوایەوە وێڵن و نە
ئاوڕێکیان لێ دەداتەوەو نە
دەیگەنێ، ئاخر ئەو دوورتر لەوە
ڕۆیشتووە کە وێیرابگەن.

* ڕەش بە هەمووان ناحەزە و سپی
جوان. منیش وەك چیاکان تا بەرزتر

هەڵدەکشێم، لە ڕەشەن دوورتر و لە
سپی نزیکتر دەبمەوەو مینا
سێبووریی بەفر بەسەر لووتکەوە،
سێبووریم دێت بەو سەر و ریشە
سپیەمەوە.

* کە هەر خۆی بوو تەنیا و
سەرگەردان، ئۆقرەی لێ بڕابوو.
دڵنەوایی پێدا کە حەوای پێ
بەخشی. چ دیارییەکی بەنرخە
حەوا! نرخی بزانە و تێکی مەشکێنە
ئەی ئادەم، دەنا سەرگەردان و ئۆقرە
بڕاوی وەك بەرێ.

* لەجیاتی ئاو فوو بە ئاگردا مەکە،
ئاگر بە فوو ناکوژێتەوە،

ئەگەشێتەوە.. هەرچەندە تاریکی
بەرسنگ بە ئەرزو ئاسمان بگرێ،
تریفەی بۆ راو ناکرێ، چونکە مانگ
بە تاریەشەو ناڕەوێتەوە،
ئەدرەوشێتەوە..

* بۆ نەتدی کە سەوزەگیا روایەوە!
دوای ئەوەی کە زەوی رووتەنت
دیو خەزان هەر زلێکی بە لایەکدا
هەڵفڕاند! تۆ بڵێی ژیانەوە لەسەر
پنجێك کە رەگی داکوتاوە دژوارتر
بێت لە ئافراندنێك لە نەبووەوە
هاتبێتە بوون؟!

* منداڵێك بەرپەرچی گەورانی
دایەوە و نەخوێندەوارێك رێبەرایەتی

خوێندەوارانی کرد. ئەمیان عیسا و ئـەویان محەممـەد. ئـەو ویسـتەی لەسەرووی ویستەکان، هی دەستێك بوو لەسەرووی دەستەکان.

* گـوتی: تـۆ بـۆ ئـەو نیشـتمانەت خۆشدەویێت؟ گوتم: ئاخر پەروەرێنم منی لە قوڕی ئەو خاکەدا شێلاو لە پنتێکـی ئـەو خاکـەدا ئافرانـدمی، سـبەینێش زوو دەمکاتـەوە پنتـە خۆڵێکی هەر ئەو خاکە. ئەو چ شیرن بێ و چ تاڵ هەوێنی بوون و ئامێزی فەنا بوونمە.

* ئەگـەر کـاروان دە ڕێـدا نـەبێ، کاروانسـەرا سـارد و سڕە. گـەرم و

**گوڕی دە جوولە و بزاو دایە و هەم دە قازانج.**

*** لەو ڕۆژەوەی کە کەس نازانێ کەی بووە، کە بووە. تا ئەو ڕۆژەی کە کەس نازانێ کەی دەبێ، کە دەبێ. هەموویان بێ خەبەر لە هاتن و چوون بێ پسانەوە دێن و دەڕۆن. نە هیچ بوونو نە هیچیان لێ دەمێنێتەوە، جگە لە ناو. ئەویش لە پای کار و کردە، وەك حاجی کە فەرمووی: (ئەوەی باقی بمێنێ هەر ناوە)*[1].**

---

[1] – (مەرگ و ژین میسلی سێبەر و تاوە

ئەوەی باقی بمێنێ هەر ناوە) – حاجی قادری کۆیی.

* به قەرا خۆت پێداویستی بخوازەو زیادە لە خۆت بارگرانییە. ئەگەر لە تینووان چوویە سەر رووبار باوەش بە شەپۆلەکانیدا مەکە با نەتبات، پڕایی لوولپێچی دەستت ئاو هەڵێنجەو بیخۆرەوە. گەر لە برسان سەرت بەناو باغی عەدن داکرد، هێشوویێك تریٚ و مشتیٚ هەنجیر کیفایەتە، بەری هەموو رەز و درەختەکان مەڕنە با نە گەنیٚ. ئەمما ئەگەر داخوازی عەقڵ و زانست بووی، خۆتیان پیٚ بسپێرە و مەگەڕێوە دواوە، چون ئەوان دەتبەنەوە سەروچاوە.

................................................

* چۆنی دەبینی هەروات دەبینیٚ، تۆ گوڵـت بـۆ روانـد و هـەنگ شـیلەی پێـدای. مـار دەیـەویٚ پاژنـەی پێـت بگەزیٚ، تۆ بە پاژنەی پیٚ سەری پان دەکەیـــەوە!! پاداشـــتی بەخشـــش هەیەو تۆڵەی سزا !

* کەلاك داڵ راناکێشێتە سەر خۆی، ئەوە داڵی هەڵوەدایە بەدوای کەلاکدا زەوی لـــە ئاسمانـــدا دەپشـــکنیٚ، دۆزینەوە بە هەستی تیژ بۆنی و تیژ بینی ئەوە نەك بە بۆنی ئەم. زینـدوو دەگەڕ دایە و مردوو دەگۆڕ.

* هـــیچ شـــوانێك گـــورگ لـــەجێی سـەگەل ناخاتــە بــەر ران، نــەبووە

گورگێکیش مەڕ بۆ خوریەکەی لە کۆز بڕفێنێ. ئەگەر شوان ئەوەی کرد بزانە نەك ران، خۆیشی گورگانخواردوو کردووە. بەڵام هەرگیز گورگ ئەویان ناکات، چونکە ئەو بە دوای تێرکردنی زگە و ئاتاج بە کەپەنی خوری نییە.

* گابەردێ لە قەدی شاخێك بڕمێ و بانگرۆز بێتەوە خوارێ، دەبێ ئەوەی لەسەر لووتکەیە سۆراخی ئەوەی بنار بپرسێ. دەنا حەفتا هەورەتریشقە بدا لەوەی سەر، کەسێ لەخوارێ نابینی بڵێ چ خەبەر؟!

* هەژاری وەك مۆرانە كە دار دەخوا دەروون دەخـوا. ئەگەرچـی پێگـەی زۆر نەوییـە، بـەڵام پلـەی زۆر بڵنـدە. پێموایە پلەی شەهیدانی هەیە..

* گوتی: توێکڵ لە کوێ و کاکڵ لـە کـوێ! وەك ئـەوەی کـە کاکـڵ هـەموو بێ و توێکڵەکە هیچ. ئەم گوتی: ئـەو هـەمووە بـەو هیچـەوە پـارێزرا تـا پێگەیی، دەنا ئەویش هەر زوو پووچ دەبووەوەو دەبووەوە بە هیچ.

* لە گۆشەی تەنیاییدا تـەریك بوون، خەڵاتـە وەك لەگـەڵ خۆپەرسـت خەریك بوون. لەملا ناخ ئاسوودەیەو

خـەیاڵ راحـەت، لـەولا وەك شووشـە دەشکێ کەرامەت.

* ئـەو کە هەمیشـە چاوی تـەڕ بوون بزەی هاتێ. گوتم: دەڵێی دەرووێکی بـــەخێرت لێ کراوەتـــەوە؟ گـــوتی: دەمێکە چاوەڕوانم و دوا دەرووم کە هەر دەبێ لێ بکرێتـەوە کرایـەوە. خۆ کاری عیشـق هـەر چاوەڕوانی نییـە، دیداریشی دەبێ! عیشقی ئـەو عارفـە نموونەی باڵایە!

* مـرۆڤ هەرچـەندە زۆر بچـووکە، لـە درز و عاسێشدا خۆی حەشار دا، نـە لـە دیـدەی ئـەو ون دەبـێ و نـە لـە دەســتی ئــەو قوتــار. دەســتی ئـەو

ئەچێتە هەموو ملێك. ئەو ملانەی،
کە هەر خۆی وەستاکارانە قیتی
کردنەوە.

* بەهاران زوو کرووك سەر
دەردێنن و مژدەی ژیانی نوێ دەدەن.
دیوتە کە ئەو کرووکانە چەند جۆر و
چەند رەنگن؟! مرۆڤەکانیش هەروا
لەو خۆڵە سەریان دەرهێناوە و
هەریەك بە رەنگێ باغی ژیان
دەڕازێننەوە!

* مرۆڤی گەورە گەرچی وەك چیا
سەخت و خۆڕاگرە، بەڵام وەك بەرد
رەق نییە، بەڵکو وەك مانگ
تریفەکانی بە ئارامی دەبەخشێتە

هەمووان، تەنانەت بەو سەگانەش کە
دوور بەدوور پێی دەوەڕن.

* هەرچەندە دەریا و زەریاکان پڕتر
بن، چ فایدەیە ئەگەر سەرزەمین پاراو
نەبێت؟ ئەوەی تینووە ماکی خاکە
نەك بارستایی ئاو. هەر ئاو بوو لە
زەریا هەڵسا و بوو بە هەڵم، هەر
خاکە بە حەسرەتی داکەوتنی ئاو.

* بە سەرسامییەوە لێی راما و
گوتی: خۆر چەند گەورە و رووناکە!
ئەو گوتی: کوا خۆر لەچاو ئەو
گەردوونە پان و بەرینە، رووناك و
گەورەیە؟! ئەمما کە رووناکە هی
ئەوەیە کە ئەو هاوێنەی رووناکی

نوورە. ئەو بینایییەی من و تۆش کە ..................................
تاریك و روون لێك جویٚ دەکەنەوە، ..................................
هاوێنەی بچکۆڵەنە بە وێنەی خۆر. ..................................
وەك خـــۆر شـــەوقی ئـــەویان تـــیٚ ..................................
دەبریسکێتەوە. ..................................

* بەخشندە دەبیٚ چارەی رۆشن بیٚ. ..................................
ئەگـــەر مـــۆن بـــوو، حاشـــا کـــە ..................................
بەخشندەبیٚ ئەو چرووکە. ..................................

* ئەو پاکی پێدان و هەر ئەو پاکە ..................................
ناپاکییەکانی ئەوانی ئاشکرا کرد و ..................................
بـۆ پـاکی رێنـوێنی کـردن، کەچـی ..................................
ئەوان بوختانیان پێکردو ناپاکییان ..................................
دایە پالٚ. تۆش ئەم سەربوردەیەت ..................................

بیســـتووە، ســـەربوردەی مەریەمـــەی

پاکیزە و عیسای مژدەبەخش ؟!

* لـە کـەو بپرسـە کـوا زێـدت؟ دەڵـێ

زنـــار. چـــۆلەکە؟ چـــڵو پۆپـــەی دار.

ماســـی؟ قـــوولایی رووبـــار. پەپوولـــە؟

بـــاغ و لالـــەزار. ئـــەدی زێـــدی خـــۆت

کامەیـــە زادە ؟ گـــوتی: هـــەر لـــە

تاریکایی رەحمی دایك تا گۆڕی تار!

* رەگـــی دار تـــام لـــە قـــوولایی خـــاك

وەردەگریٚو لە بەرزایی لکەکاندا ئەو

تـــام و بۆیـــە لـــە میـــوە و بەرەکەیـــدا

دەداتەوە. پرسی: چۆن ؟ گوتی: ئەو

نەوییە عاشق بەو بەرزاییەیە و ئەو

مەعشـــوقەش بەخشـــینو قوربـــانی لـــە

عاشقەکەی دەویٚ! عیشقی سەر بە
سۆزی نەوییەوە دێتە بەر. وەك چۆن
نەوی بە عیشقە بەرزەکەی دەچێتە
سەر.

* ئەگەر لەخۆڕا دڵت لە کەسێك
پیس و پڕ کرد، بۆ چرکەساتێك
خۆت باوێ جێی ئەو، دەبینی کە
چەندە مەزڵوومی، ئەو کە مەزڵوومە!

* سەیرم بە بەنی ئادەم دێ، هەر
هەموویان هاوار دەکەن یاسا یاسا!
فەرمانڕەوا دەیەوێ بە یاسا خۆی
بپارێزێ. رەعیەت دەیەوێ یاسا
بیپارێزێ. نەدار تەمای بە یاسایە بۆ
مانی سەر. سەرمایەدار دەیەوێ بۆ

سـامانی یاسـا بکـات بـه پـارێزەر.
سـەیرە هـەر هـەموویان دەیحـوبێنن،
هەر هەمووشیان هەریەك لە ئاستی
خۆیەوە دەیشکێنن.

* گـوتی: چ دەبـێ کاکـه ئەگـەر تـۆ
ببەنـــە ئـــەهوارەکان و یابەیـــەکیش
بهێنننـــە دونـــدی قەنـــدیل. گـــوتم:
ئـەهوارو قەنـدیل سـێبەر لـە گـۆڕی
هـــەردووکمان دەکـــەن. هـــەم مـــن
مێشووله دەم له کـەوڵم دەنـێ و سـەر
دەنێمەوە، هەم سەرما سواری سەری
ئەو دەبێ و گیانی دەتەزێنێ.

* کـه میلـی تفەنگـەکان راکێشـران،
هـەم دەنگـی تەقـە دەبیسـترێ و هـەم

**ناڵـە. ئـەمیان گـوێ کـاس دەکـا و ئەویان دڵ دەتاسێنێ.**

*** گوتی: زۆریـان سـەبارەت بـە دایـك گوتووە تـۆ چی دەڵێی؟ گوتم: دایك خاوەن قەرزێکی گەورەیە، لە دەستی بــێ زێتریشـــی دەخاتـــە ســـەر. بەخشندەیەکە چاو لە بەخشندەکەی خۆی دەکات.**

*** رێزت هەبێ زێڕت دەبێ. زێڕی بێ رێـز نـەك بـەهای خۆشـبەختی نییـە، سەرەخۆرەیە سەرەخۆرە.**

*** ئەگــەر دەســتوور وابوایــە هــەر کەسێ لـە تـەك بینـاکردنی خـانووی**

ماڵەکـــەی گۆڕێکیشـــی بـــۆ خـــۆی هەڵبکەندایە، لە ترسی ئەوەی نەبادا لـە بـان هەڵبـدێرێ و بکەوێتـە چاڵی گۆڕەکـە، خانووەکـەی هێنـدە بڵنـد نـــەدەکرد. گۆڕستانیشـــیان لـــە پەنایـــەکی دوور لـــە ئـــاوایی ئاواکردۆتەوە.

*خۆ گوڵ هـەر بەتـەنێ جوانی نییە! ئەگەر وابێ نابینایەك چۆن تاسەی تامەزرۆیی بە گوڵ دەشکێ ؟!

* بـەرگێکی لـە کوتـاڵی حـەریر لـە کەعبـە وەردێـنن، وەسـتاکاران بـە داوی ئاوریشـمی ئەیـدروون و بـە ئاوزێڕ زێڕکفتی دەکەن و بە هەزار

جۆر سیمە ئەینەخشێنن. حاجی بە
دیتنی ئەو بەرگە حەریرە زێڕکفتە
نەخشاوە سەرسام بێ خەڵەتاوە، کە
بەردی ژێر کوتاڵی بە خەیاڵدا
نەهاتبێ و بەو بەردەوە بە کارزانی
دانا دڵبەست نەبووبێ.

* رەش پێست و سپی پێست و
سوور پێست لە یەکلاوە هاتوون و
دەچنەوە ئەوێ، وەك بەفرو تەرزە و
باران کە لە ئاوەوە هاتوونە و
دەبنەوە بە ئاو.

* وا مەزانە کە خۆر هەڵهات ئیدی
تاریکی شەو دەبڕێتەوە، هاگا دیتت
ئەمیش بەدوایەوە داهات. دڵخۆش

مەبـە کـە یـەکیان ئـەوەی دیکـە راو
بنـیٚو نەگەڕێتـەوە، بـە نەگەڕانـەوەی
ئەم ئـەویش کۆتـایی پێدێت. ئەوسا
مـن و تـۆش هیچمان بـۆ نامێنێتـەوە
برا !

* هەیـە پێـنج کتێبـان دەنووسـیٚ و
هەیە دە، هەشە پازدە. ئەدی ئـەوەی
تەنها کتێبێك دەنووسیٚ چی؟! هونەر
لە زۆریدا نییە لـە جۆریدایـە. ئـەوەی
دەینووســی بــا بەهاکــەی بــایی
رەنجەکە بیٚ و زیاتریش.

* جغــارە دەردێــك دەرمــان ناکــات
ئەگـەر زیـادی نـەکات! دیـارە زیـادی
دەکـات، کەچـی هێشـتا تـووتن لـە

ریــــزی رێزلێگیراوانـــه. بێنرخێکـــه
هەرچـی بەنرخـه لەگـەڵ کوژانـەوەی
خۆی دەیکوژێنێتەوە!!

* منداڵ نـەمامی شلکی تـازە باخـە.
مـام جۆتیـار کـە باخێـك لـە نـویێ
دادەنـێ، لەگـەڵ چانـدنی نەمامـەکان
بـیر دەکاتـەوە لـە بـەر و هـەم لـە
سێبەریان. مینـا بـاوان، کـە بـە هاتنـە
دونیـای تـازەزاوا، بـیر دەکەنـەوە لـە
حـاڵی ئـەو، هـەر لـە گـاگۆڵێ تـا
ئاهەنگی بووك و زاوا.

* ئەگەر هیچ شتێك لەوانی بەرێ فێر
نەبووی، چاوەڕێ مەبە لەدوای خۆت
کـەس هیچـت لێـوە فێربـێ. ژیـان

ڕێگایەکی نەپساوەیە بە قۆناغ و بە
ئـــەزموون. ئەگـــەر قۆنـــاغی ئـــەوان
دووره لـــه قۆنـــاغی تـــۆ، ئـــەزموونی
ئەوان دوور مەخـەرەوە لـە ئـەزموونی
خۆت.

* عاشـقێ لــه تــاریکی و تەنیاییــدا
چاوەڕێی مەعشـوقەکەی بوو، یـەکێ
سەرکۆنەی کرد و پێی گوت: مەگـەر
دێوانـەی، دەنا بـەو تاریکستانە کێ
دەتبینـێ؟ ئەگـەر داخـوازی بەرچاو
کـەوتنی، بـڕۆ چـرایەك هەڵکـە و ئـەو
نـــاوە روونـــاك بکـــەوە. عاشـــق لـــە
وەڵامدا گوتی: چرام بۆ چییە کاتێك
مـــن چـــاوەڕێی چـــرام و هـــەرگا

**دەرکەوێ ئەو ناوە دەکاتە چراخان و**
**لە شەوقی خۆیدا دەمدۆزێتەوە.**

*** ئاسنی سارد بە گەرمی بکوتە**
**ئەوەت دەبێ کە دەتەوێ. بە ساردی،**
**لە رەنج بەخەساری زێتر دەسکەوتت**
**نابێ.**

*** تەنیایی سەختە و خەفەت**
**دەڕوێنێ، خەفەتیش قوڵپی گریان**
**هەڵدێنێ، لەگەڵ هەندێش بڕێ جار**
**گریان پێویستە بۆ ئاسوودەیی**
**دەروون. ئەگەر ناخ بەتاڵ نەکرێتەوە**
**لە بارگاوی بوون، بەدوور مەگرە وەك**
**هەورەتریشقەی مانگی نیسانێ، لە**
**دارەبەنی دڵ بدا و بیسووتێنێ.**

* بولبولێـك لەسـەر كـەدی دارێـك دەیخوێنـد، هاوڕێكـەم ئیرەیـی پـێ بـردو پـەلار نـا، پـلاری تێگـرت و گوتی: بۆ ناخوێنی، جێگات بەرزە و هـەوای سـەرت سـاز !! لەودەمـەدا بولبـولێكی دیكـە هاتـە لای و دوای جریوەجریـو باڵیـان هـەڵگرت و هەڵفڕین. دەركەوت نەغمەی دووری هـاودەمی بـوو نـەك لافـی نیشـتن لـە بەرزایی!

* لای كەسێك پێمەكەنە كە دەزانی خوێناوی خەفەت لە دڵی دێ. ئەگەر ئەویش خەم بەرۆكی نەگرتبا، ئێستا وەك تـۆ بـەكامی دڵ لـە تریقـەی پێكەنینی دەدا.

* گـوتم: گوناهبـار چـۆن تۆبـەی لێ وەردەگـیرێ؟ گـوتی: تـاریکی هەرچـەندە نووتـەك و دەیجـوور بـێ، تررووسـکایی روونـاکی باشـتر دەیسمێ! تۆبە رووناکییەکە هەرگا لە دڵی تاریکدا چووە ژووریّ، پاك و رووناك و بێباکی دەکا.

* موسـافیرێك دەبینـم دەڕێدایـە و لـە گـەرووان ئـاوا دەبـێ، نـاوە نـاوە لـە ملـەی گـەرووێك سـەردەردێنێتەوە و هەمـدیس ئـاوا دەبـێ، تـا لـە دووردا دەگاتە سەراب و ئیدی ئەو لەوێ بە یـەکجاری ئـاوابووە. ئـەو موسـافیرە مـن و تـۆ و ئـەوانی دیکـەین، کـە دە رێداین و هێدی هێدی لە ملان وەدەر

دەکەوینــەوە و لــە گــەرووان ئــاوا ..........................................
دەبین و هەر کە کەوتینە نێو سەراب، ..........................................
ئیــدی ئــاوڕ لــەدواوە نادەینــەوە، ..........................................
چـــونکە دەزانـــین هێنـــدە دوور ..........................................
ڕۆیشـتووین، کـە لـە بینـایی چـاوان ..........................................
دەکەلی هاتووین. ..........................................

* ئــەوەی ئــازاری کەســێکیدا، ..........................................
مـانگێکیش دە دڵیـدا شـایی بگـەڕێ ..........................................
چلە بەسەرناچێ هەتا شینێ لە تۆڵە ..........................................
وەرنەگرێ. ..........................................

* گــوتی: ڕووســوورتر لــە گــوڵ ..........................................
دەتبینم، هێورتر لە تکانی شەونمی ..........................................
سـەر پەلکـە گیـا و بڵنـدتر لـە گەواڵـە ..........................................
هــەوری نیســانێ. گــوتم: کــە ..........................................

**وامدەبینی سەرت نەسوڕمێ، چونکە لــە بنـــی دەریـــاوە هـــاتووم و بـــە ئەنـدازەی قـووڵایی دەریـاش بـەرز ڕۆیشـــتووم بــۆ قووبــەی ئاسمـــان، هاتوومەتەوە وەك شەونمەكەی دوای تاوەباران، تا ڕژاومەتە ڕەگی گوڵاڵە سووران.**

*** كێوییش كەیی دەبێ. لەبەر ئەوەنا كە حەزی كەیی بوونی هەیە، لەبەر ئـەوە لـە ژینگـە كێویلەكـەی خـۆی هـــەترە كـــراوەو دوورخراوەتـــەوەو ناچـار بـە خۆگونجانـدنی ئێرەیـە، بەڵام تا مردن چاوی هەر لەوێیە.**

* ئەوەی خۆی لە سەری ژوور دیت با لاف لێنەدا بەسەر ئەوەی لە بنەبانە. کێوی تووڕ پایەی زۆر بەرزترە، ئەگەرچی لەئاست چیای هیمالایا بانی مەقانە.

* زستان چەندە سەخت و تووش بێ، بەهار هەر دێتەوە و بە بارتەقای سەقەم و سەرما سفرەی رەنگینی خۆی رادەخات. زستانی تەڕو بەهاری فەڕ. بەستێنی بەفری سپی پشتێنی گژوگیای سەوزی دەبن دایە.

* راوکەرێ بەو تیرەی نێو کەوانەی دەستی سێرەی لە نێوچاوانی

کارمامزێك گرت، کارمامز کە هێزی
ئەژنۆی شکابوو، بە زمانی چاو بە
راوکــەری گــوت: تــۆش وەك خــۆم
دەبینم و نابوودتر، ئەوکاتەی تیری
ئەجەل سێرە لەناوچاوت دەگرێ !

* روونــاکی لــە کــوڵینگ و درزی
دەرگــاش دزە دەکاتــە ژووریّ. لــە
دەرێ باسێك لە تیشك و لە رووناکی
نییــە کــە هەیــە. ئــەوە حــوکمی
تاریکـایی ژوورە کـە تروسـکاییەك
رۆشنایی لە خۆر باشتر دەناسێ.

* تاڵاوێك شك ئەبەی کە شیرینە ؟!
ئەگــەر چەشــتبێتت دەزانــی تــامی
چۆنە. پەیمانی ئەوە کە تاڵاوی دا

شـــيرينيش دەدا. هــــەتيو چــــەند ....................................
هەناسە سارد و نابوود بیٚ، لای ئەو ....................................
خۆشەویســـتترە. پاداشـــتەکە چـــەند ....................................
بەرابەرە بە ئاھ و حەسرەت. ....................................

* کەسـێك گــەر بــۆ مەعشـووقەکەی ....................................
هۆش و بیری نەدۆڕاند، سەدجار بڵیٚ ....................................
من عاشـقم بـەقای پیٚ مەکە. عیشـق ....................................
توانـــەوە و فـــەنابوونی عاشـــقە لـــە ....................................
مەعشـــــووقدا. وەك ئەســــتێرەکان، ....................................
هـــەرگا تـــاو دەرکـــەوت ئـــەوان فـــەنا ....................................
دەبـنو دەتوێنـەوە، کـە تـاو پـەڕی و ....................................
ئاوابوو، ئەوان عەودالٚ و سەرگەردان ....................................
بەدوایــــدا دەردەکـــــەون و دەکەونـــــە ....................................
جریوە جریو. ....................................

* چاوی سەر بەس نییە بۆ بینین، ..................................
بەچاوی دڵو ئاوەزیش بڕوانە نەبادا ..................................
دەسخەرۆی رواڵەت بی. پێوەری ..................................
رواڵەت هەمیشە کورت دێنێ. ..................................
جەوهەری پاك لەتوێی ناخدایە، ..................................
وەك مەعدەنی ساغ لەتوێی خاکدا. ..................................

* پیری دڵم رووی تێکردم و ..................................
فەرمووی: چەندە بەو غەمە مات و ..................................
پەرێشانی هێندەش پێی ئاسوودە و ..................................
دڵخۆشبە. گوتم: چ شادییەك لەو ..................................
غەمەدا هەیە ئاسوودەم بکات ؟ ..................................
فەرمووی: هەر ئەو غەمە خۆی ..................................
نیشانەی بوونی شتێکی بەنرخە کە ..................................
ترست لێی هەیە. کەوابوو تۆ ..................................

شتێکی بەنرخ شك دەبەی، ئێستا کە
غەمی ئەوتە.

* چڵك و قرێـژ هەرچـەندە گـرد بـێ
دەســــــڕێتەوەو دەڕوا. ئـــــەوەی
دەردەکــــەوێ و دەمێنێتـــەوە بـــێ
گەردییـــەو پـاکی. لــە ئەزەلــەوە تـا
عــەدەم پیسـی بــە تووندا چــووەو
دەچـێ، ئــەوەی ماوەتــەوە و هــەر
دەشمێنێتەوە پاکییە.

* هەموو شتێك نرخی خۆی هەیە چ
کـەم بـێ و چ زۆر. ئـەو کـەم و زۆرە
دەگـۆڕێن بـە گـۆڕانی هەڵوێسـت و
زەمـەن، وەك تـیر و دوا تـیری کـەوان.
گولله و دوایین گوللـەی نێو سێرەی

تفـەنگی جـەنگاوەر. وەسـیەتنامە و
دوا دێڕی خەمناکی گەردن ئازایی.

* لــە شــەوێکی ســارد و ســڕی
زسـتانێکی تـەڕو تووشـا، کـە لـە
ژوورێکــی گــەرم و گــوڕ و لــەناو
پێخـەفێکی نـەرم و نـۆڵا راکشاوی و
بەم سەرمایە زەنگوڵەی ئارەقە لەبن
هــەنگڵت دێنــەخواریّ، لــەخۆت
پرسیوە بەم شەوە سارد و نووتەك و
دەیجـــوورە ئەگـــەر کەســـێك،
بنیادەمێك، هەر لە جنس و تۆرەمەی
بــاوك و بــاپیرت، لــە چــیایەکی
بەسـتەڵەکا، لەسـەر شۆسـتەیەکی
بێگیانــا، یــان لــەناو خێزانێکــی
بێـدەرەتانا چـەقەی ددان و جـیڕەی

ئێسقان و له سەرمایا لەرزی له
چۆكان بێت و نه خەو بیباتەوه نه
مەرگ! ئەریٚ كەسی وەهات لەناو
ئەو پێخەفە نەرمە و لەو ژووره
ئارامو گەرمە بەبیر دادیٚ ؟!

* قسە وەك پەرێزی گەنم پڕه له
دانو زیوان. جۆخینی قەڵەم پاك و
سووری دەكاتەوەو كاكڵەی دانەكه
دەردەخات. ئەوەی له زاری قەڵەم
دەڕژیٚ پێشتر به پرتاو به دڵدا
هاتووەو به هەڵەشەیی به زماندا
ڕەت بووه. ئەوه قەڵەمە شەن و
كەوی كردووەو تۆ خاسی
دەخوێنیەوه لالۆ.

* ئەگەرچی تۆی شارەزا نزیکی لێم، بەڵام ئەوە منی نابەڵەدم کە دوورم لێت. پەروەردگارا توانایی تۆیە کە داتگرتووم، دەستەپاچەیی منە کە ناتگەمێ.

* گوتی: جوانترینی جوانەکانت دیوە چییە؟ دامام. زۆرم هێناو برد. هەزار و یەك جوانم بەیەك گرتن تا یەکەکە لە هەزارەکە دە کەلی بێنم و بڵێم ئەمە. دیتم هەموویان هەر یەکن و وەك یەك. جوانی لە کرۆکدا هەمان واتا، هەمان خەسڵەت، هەمان رەونەقی هەیە. ناوی خۆی بەخۆیەوەیە جوانی!

* مێژوو ئەوە نییە کە بیستراوە یان نووسراوە، بەڵکو ئەوەیە کە روویداوە. تۆ ئەوە بنووسیەوە کە جێی حەزە و ئەوە بسڕیەوە کە ناحەزە، لێت دەبێتە ویست و داخوازی نەك مێژوو. لە نووسینەوەی مێژوودا رووت لە راستەقینەبێ تا هەر راستەقینە بناسی و هەر راستەقینە بنووسی.

* دەمی تاوپەڕان کە خۆر لە زەردە دەدا، بۆ ساتێك چاوەکانت بنووقێنەو لەخۆت بپرسە ئەو رۆژی رووناکەت چۆن گوزەراند؟! عومری نووحیشت بێ هەر دێتو دەڕوا، دەمێنێتەوە کار و کردە.

* لاف و گـەزافی لێـدەدا کـە چـەند
پلەیـەك هەڵکشـاوە. ئـەوانی نـەوی
دەدیـت و خـۆی بڵـند. تـا ساتمەی
بـردو بەدەمـدا کـەوت. بـە ئەسپایی
چرپاندیە گوێی: خواری بۆ چووی
بۆیـە بەلـەز هاتیـە خواریٚ. پێتوابوو
تـا بـەرزتر بـی هێشـتا نزمـی،
راستییەکەی تا نـەوی بی بـەرزتری.
راسـتی کـرد دەروێـش دەرهـەق
لەخۆبایی.

* دەمـی هێمنـایی وەسـەر یـەکی
دەنێـی و فراوانـی دەکـەی، دەمـی
تەنگانـە لێـی بـەری و هـەی داد!
سـەربانت پانـە تـا خاترجـەم لـەبنی

وەحەوێی، لەسەرێ بەفری زیاتری
لەسەر دەکەوێ و دەبێ فڕێی دەی.

* شوانێ لە نواڵێ شمشاڵ دەژەنێ و
دەروێشێ لە حوجرەیەکا دەف
لێدەدا. تۆ ئەمیانت پێ خۆش بێ
یان ئەو، هەر نەوای شمشاڵ لای
شوان و هەر دەنگی دەف لای
دەروێش پەسەندو خۆشە.

* سەفا و جەفا دووانەی ئاشنان.
قەت بەبێ یەکدی هەڵناکەن، کە
پێکەوەشن یەك میزاجی ئەوی دی
دەکوژێ. گەر لەم سەرەی رێ
بەختەوەریت دیت بزانە ماتەم
لەوسەر ئامادە. خۆ گەر ئەمسەرە

کۆست گارەی دابوو، بزانە دەرووی
ئەوسەر گوشادە.

* ئـەم لـە سـەفەری هـات و نـەهاتا
دەکۆشا سەری ساغ و سەلیم دەرباز
بکـا، یـار لـە چاوەڕوانیا کـڵاوی بـۆ
سـەری دەچنی. هـەردووکی هـەر لـە
خـــەمی ســـەر دابـــوون. ئـــەمیان
ئەیەویسـت حەشـاری بـدا تـا قوتـار
بیٚو بگەڕێتـەوە نـاو سـەران، ئـەویان
ئەیەویسـت پۆشـتەی بکـات تـا دیـار
بێ لەناو سەران.

* پرسـی: ئەگـەر کێمـی تێـزا ئـەو
برینـە ساڕێژ دەبێ؟ گوتی: بێشک،
ئەگەر ئاوی حەیاتی بگاتێ. پرسـی:

ئـەو چـۆن ؟ گـوتی: ئومێـد، ئومێـد
ئاوی حەیاتە. دەستت لە ملی ئومێد
وەرینـە، هـەر ئـەو هـەتوانی دەردو
برینە.

* ئەگـــەر پـــەلت ســـســـت و پشـــتت
چـەما، چـاوت کـزو بـەفری سـپیت
لەســەر ســەر نیشــت، هێشــتا بزانـە
مـاوی تـا ئـەوە ببینـی کـە نەتـدیوە.
ئـەوەی دیوتـە لـەو چاوتروکانە هـەم
کەم نییە و هەم زۆر.

* لـە گـڕ گـەرمتر ئـەو خورپـەی دڵـم
سەردەمی لاوی، لە بەفر ساردتر ئـەو
ترپـەی دڵم ئێستا کـە پیرم. ئـەودەم
دێوانـە و هـۆش لەدەست چوو بووم

بــەدەم عیشــقەوە، ئێســتاکە ژێــرم ..........................................
لەپای ئەزموون و پەند و مەشقەوە. ..........................................
خۆزیا کە لاو بووم هۆشم هەبووایە ..........................................
تا نەخەوتمایە، لە پیریەتیشدا هێزم ..........................................
هەبووایە تا نەکەوتمایە. ..........................................

* ئەگـەر نـۆرەی ئـەو بـوو دواهـەمین ..........................................
تـیرت تێبگـریێ، هـەموو هونـەرت بـۆ ..........................................
خـۆلادان بـێ. خۆپـەنادان لـە تـیری ..........................................
تێگیراو هیچی کەمتر نییە لـە نیشـان ..........................................
شکێنی، بگرە ئەولاتر. ..........................................

* پرسـی: لـە دارەتـی دونیـا چ شـك ..........................................
دەبـەی بەدەسـت خـۆت بـێ، هـاتن و ..........................................
چـــوون ؟ نــــەفس و رۆح ؟ دارا و ..........................................
نەداری ؟ گوتم: جا ئەوانـە چیین کـە ..........................................

مـن هـی گـەورەتر لەوانـەم هـەس!
گوتی: کامە؟ گوتم: هـەر ئەوەی کە
هەموو ئەوانەی داوە و دەیانبا.

* پێتوابـوو یوسـف قوربانییـە و
براکان ستەمکارو یـەعقوب دڵشکاو!
بە رواڵەت وایە، بەڵام ئاشتبوونەوەی
ئـەو سـێیە دەریخسـت کـە سـتەمکار
خۆیشـی قوربانییـەکی دیکەیـە،
قوربانی هەوا و نەفسی ئەممارە.

* بێهـوودە نییـە پەروانـە بـەدەوری
شـەمدا دەخولێتـەوە، لۆمـەی
شەمشـەمەکوێرەش نـاکرێ کـە شـەو
دەکەوێتـە بزاو. نـە ئـەم لـە تاریکیدا

هەڵدەكا و نە ئەو لە رووناكيدا تەيدەكا.

* رتووشى ناوێ، سروشت بە رەنگ‌و بۆى خۆى جوانە. هونەرى نواند كە واى ئافراندن، كوڕى ريشن‌و كچى لووس و تووس، كەڵى شاخدار و ئاسكى سرك.

* كەس لە ئەو ناچێ و هيچ وەك ئەو نابێ. حاشا گەر وابێ!! نەفى و ئيسپات پێكەوە نابن مەگەر لەو دابێ ! (لا اله) نەفى هەر خودايەكە و (الا الله) ئيسپاتى هەر ئەو خوداى تاقانە.

* بۆ جوانناسی جوانبینی دەوێ. بۆ جوانبینی چاوی جوانی بێ گزی و بێ فیزی دەوێ. چاو وەك ئاوێنە وێنەی تێدا دەبیندرێ. وێنە هەرچەندە روون بێ لە چاوی لێلا لێل دەردەکەوێ. خەوشی چاوە وێنەکان خەوشدار دەکات.

* چەندە جوامێر و چاکەکاریش بی، رێ مەدە کەس سوپاست بکات، چونکە سوپاسکردن هەستی بەندەکانەو تۆش خۆت هەر بەندەی.

* دڵشکاوێك دەردەدڵی خۆی بردە لای بولبول، بولبول زۆر حەزین چریکاندی. ئەم ئاسوودە بوو کە

پێیوابوو لێی تێگەیی. نابەڵەد بوو،
نەیزانی چریکەی خەمناکی بولبول
بۆ حاڵی پەرێشانی خۆی بوو نەک بۆ
ئەم. هەریەکە و هیوای خۆی هەیە و
هەزار ترس و دەرد.

* گوتی: پاکترین شتێک لەسەر
زەویدا تۆ دیوتە چییە ؟! گوتم: ئاو.
هیچ وەک ئاو پاک و بێنەزیر نییە.
هەر بۆیەشە باڵادەست ئەوی کردە
سەرچاوەی ژیان.

* ئەگەر درک نەبوایە گوڵ ئەو
تەمەنە کورتەشی نەدەبوو کە بووی.
کاری درک پاسەوانییە و
پاسەوانیش گیانفیدای سەر. لۆمەی

دڕك مەكە كە دەستت دادڕێ گەر بۆ
گوڵت برد. ئەو دەرهەق دەستدرێژ،
تیژ و خوێنڕێژە و هەقی پێبدە.

* نـــاگونجێ كینـــە دە بەخشـــندە،
گولیی دە گوڵو مەرایی دە برایی.

* جـــام چ كـــــەوتبێو چ كێـــــل
هەڵكـەوتبێ لێـی دەڕژێ، كـە كـەمی
تێدا بێ یا پڕ. گـوتی: گـەر دەتـەوێ
لەو جامە نەڕژێ مەهێڵە نە بكەوێ و
نە پڕ. گوتم: دەعوا هەر لە ڕژانی ئاو
نییە، ئەگەر جام شكا چی؟! گوتی:
هەیهات، ئەوكات نە ئەم دەمێنێت و
نە ئەو!

* هەرکەس ناسناوی دەستی کاریەتی. لە جەوهەری خەنجەری تیژ ئاسنگەر ببینە و لە زێڕی بێ غەش زێڕینگەر. ئەسپەشێ لە غارێدا بناسە و گاجووت لەبن نیرو ئاموور.

* هەمووان گوزارشت لە خۆیان دەکەن بە خەسڵەت و تایبەتمەندی. تاو سەرمابردەڵە تین ئەداتەوە، نسێ فێنک ئەکاتەوە ئەوی بەر خۆرەتاو. بەهار خەسڵەتی مەستی هەیە و پاییز خامۆشی. لەمدا گەڵا سەوز دەبێ و لەودا گەڵاڕێزانە هەی ڕۆ.

* گوتوویانە کوێر چیت دەوێ دوو چاوی ساغ. من کوێر دەناسم سێبووری و ڕۆشنایی دڵی ویست نەك بینایی! ئەمە یەعقوب و ئەوەش زولەیخا. هەردوو هەڵوەدای یوسفی دڵ بوون، باکیان بە چاوو بینایی نەبوو، کە یوسفیش بوو هەم دڵ ئۆخەی کرد هەم چاویش ڕۆشن.

* یادکردنەوەی ڕۆژانی کامەرانی مەرجی کامەرانی نییە، ڕەنگە لەوپەڕی نائومێدی و نیگەرانی ئەو ڕۆژانە وەبیر بێنەوە. چەند باش کە وەبیر دێنەوە. ئەوە تروسکایی ئومێدی ڕۆح خرۆشێنە.

* رەنجیشی بۆ نەدەی بمێنی پێیدەگەی. رەنجیشی بۆ بدەی نەیگەیێ دەتگاتێ!! ئەمیان پیرییە و ئەویانیش مردن. گوتم: جا ئەمیان نیشانەی هاتنە بۆ ئەو! گوتی: وادەی ئەو دێ، پەکی پێناکەوێ وادەی ئەم هاتبێ یان نا.

* با تاجی زێڕت لەسەر نابێ، چ فایدەیە ئەگەر ئاوەز و هۆشی دەبندا نەبێ !

* پرسیاری لێ کرد داخۆ لەو غارە غارە، گەنج زووتر بە هەورازدا هەڵدەگەڕێ، یان پیر زووتر بە نشێودا دادەگەڕێ. گوتی: گەنج

گورجوگۆڵــەو ســەردەکەوێ، پــیر ....................................
کەنەفتەیــە و دەکــەوێ. نــەیزانی ....................................
نشـێوی مـەرگ لـە بنـاردا تەختـە و ....................................
هەورازی ژیان لـە لووتکەدا سـەخت. ....................................
پیر هەورازی بڕیوە و ڕوو بە مەنزڵـە، ....................................
گـەنج لـە مـەنزڵا هـەنگاو هەڵـدەگرێ ....................................
ڕوو بەرەو هەوراز! ....................................

* ژن گـوڵی ڕازاوەی ئینجانـەی دڵـە. ....................................
دەبــێ لــەو ئینجانەیــەدا خــۆراکی ....................................
گەشـە و گەشانەوەی گـوڵ هـەبێ تـا ....................................
ئەو هەبێ. ....................................

* خــۆڕا نــەبوو هــەموان مەســتی ....................................
بۆنەکەی بوون. بۆنی ئەو بۆنی خاك ....................................
بـوو. ئـەو دەیگـوت: مـن لـە خـاکم و ....................................

**خاکەڕام و بۆ خاکم. هەر ئەو بۆنی ..................................**
**خاکــە مەســتی کــردن. هــەر ئــەو ..................................**
**خاکەڕاییە دەربەستی کردن. ..................................**

*** سەرگەردانیٚ هاواری کرد ڕێی ژین ..................................**
**کــوانیٚ؟ دەنگــیٚ لــە نزیکــەوە بــە ..................................**
**ئەسپایی چرپاندیە گوێی: ئەوەتانیٚ ..................................**
**ڕێبـوارانی راسـتەقینە و تـۆش وەها ..................................**
**بە. وەك تەها بە، کە هات تاو لـەپاڵ ..................................**
**هــەوران هــەڵات. وەك زەبیحــوللاّ، ..................................**
**راکشــایە ســەر زەوی و گەیشــتە ..................................**
**ئــەعلا. وەك مــەولانا، کــە تــەختو ..................................**
**بەختی وەلانا. ..................................**

* چ نەنگییـــە ســـوارێك بەســـەر رەخشـــەوە بـــێو تـــا مـــەنزڵ لێـــی نەخورێ!

* پرسی: بێگیان حوكمی ئیرشادی هەیە ؟ هەیەتی بۆ نا! تۆ ئەگەر لە بەردێكا هەڵنگوتی و ساتمەت برد، ئەگەر ئەستریت لە بەری پێ راچوو، ئـەوا هـەم ئەسـتری و هـەم بـەردی بێگیـانن کـە پێـت دەڵـێن: لووتـت نەویکـە و لـە رۆیینـا هاییـت لەبـەر پێت بێ.

* حـــوكمی تـــاریکی نییـــە کـــە ئەسـتێرەکان دەدرەوشـێنەوە، ئـەوە رووناکی خۆرە کە بە رۆژ شەوق و

ڕەونەقی ئەوان لە خۆیدا ون دەکات.
نووری هەقیش هەموو نووری
ئەولیاکانی لەخۆی ون کردووە.
ئەگەر لە زوڵمەتی دونیادا ئێمە
دەیانبینین، لای ئەو کەسێک
دەرناکەوێ بڵێ من هەم. هەموو هەر
دەڵێن: ئەحەد..ئەحەد.

* ئەوەی هەم ماندووت دەکات و
هەم پەشیمان راوە دراوە. حەیفە
هەر خەریکی گرد و کۆی پارە بی و
سۆراخێکت لەو دوو دونیایە نەبێ.
کاتێک وەخەبەر دێی ئەمەی ئێرەت
لەکیس کەوتووە و ئەوەی ئەوێت
وەکیس ناکەوێ.

* خاترجەم بە لێیان و ترستـ لێ نەبن، قسە تا دە زار دایە و خەنجەر تا دە کالان و تیر تا دە کەوان.

* شەپۆلێك لە دەریا هەڵچێ و تووڕە بێ چ دەکا؟! زۆر زۆر بڕوا هەر تا کەنار دەریاکە دەڕواو لەوێ بەهێواشی دەکشێتەوە دواوە. لەخۆت پرسیوە بۆ رووە و دەریا دەگەڕێتەوە؟ مەڕاقی ناوێ، چونکە لەوێ نەبێ ناتوانێ هەڵسێ و لەوێ نەبێ ناتوانێ بڕ کا!

* هەرکەس زیندووە عەودالی رازە، مەگەر ئەو کەسەی دە دارەبازە. ئەو رازی نەما و نیازی ماوە، بەڵکو پێی

بگا سبەی لەولاوە. تۆش هەتە راز و
نیاز ؟! گەر هەتبێ، با قوتبی هەموو
راز و نیازت ئەوبێ.

* ئێوارەیەك كە دەستی منداڵەكەی
گرتبوو لە ئاوابوونی خۆر رامابوو.
لێـــی پرســـی: بـــەدیار چـــییەوە
وەستاوی بابە ؟ گوتی: بڕوانە ئاسۆ
چـەند بـەرزیش بـێ خـۆری لێ ئـاوا
دەبـــێ. بزانـــە هـــەموو دەســـپێكێ
كۆتاییشی هەس.

* ئەگـەر تـاڵ بـووی بنێشـتەتاڵ بـە،
یـــان دەنكـــە زەیتـــوون، نـــەك
مەرگـەمووش. تـا ئەگـەر قووتـدرای
دەردان بپەڕێنی، نەك بخنكێنی.

* چاکە درەختی بەردارە، ئەگەر روانـدت رۆژێك دێت هەم بەرەکەی دەچنی و هەم لە سێبەریدا دەحەسێیەوە. نەدارێکی شەکەت ئارەقەی هەنیەی سڕیەوە و پرسی: کوا بەر و سێبەری کار و کردەی من؟! ئەو گوتی: پەلەت نەبێ، چ زوو چ درەنگ کە دەستی بوو ئەوەت لە دەستی دەنێ کە دەستت بۆی داوەتێ.

* سەری کار تفت و تاڵە، ناوەڕاستەکەی سەخت و دژوار و ئاخیرەکەی پڕ تام و شیرین. کە دەستت پێکرد نیازت پاك بێ، کە

بەردەوام بووی ئومێد بەرمەدە، کە
تەواوت کرد شوکرانەبژێر بە.

* چێشتخانە هەرچەندە رازاوە بێ و
چێشتی چەور لە مشە بێ، ئەگەر
بستێك لەولاوەتر ئاودەستێك نەبێ،
هەر ئەوەی کە سمێڵی چەور
دەسڕێتەوە، هەزار تووك و لەعنەت
لە نەوسنی خۆی دەکات، کە چی
کرد بە خۆی، دوای ئەوەی کە کردی
بە خۆیدا!

* چرکە و ترپەی دڵ و کاتژمێر
هاوار دەکەن: وا هەین و بێدارین و
دەکارداین. ئەگەر ترپە و چرکەکان
چك بوون و وەستان، دەتوانی بە

گۆڕینی پیلەکان کاتژمێر وه چرکه
بێنیەوه و بیخەیەوه کار، چون ئەو
خەڵقەندەی خۆته و ئیلهام بەخشی
ئەو تۆیت. ترپەی دڵ نا، ئەو خاڵقی
دیکەی هەیە و وەختێ ویستی
خستییه کار و هەرگا بیەوێ چکی
دەکا و دەیوەستێنێ.

* کەو بە قاسپه دەڵێ ئەوەتام،
تاوس بە پەڕە نەخشینەکانی.
پرسی: تۆ چیت هەیە پێی
بناسرێی؟ گوتی: من خاوەنی
بەندەکانم و بەندەی خاوەنەکەم.
خاوەنەکەم ئەوانەی بۆ دەستەمۆ
کردم تا دەستەمۆی بم.

*** هەر لە موسا هەتا عیسا پەیك و پەیام یەك بووە. هەر لە ئادەم هەتا خاتەم پەیك و پەیام یەك بووە و بۆ یەك بووە كە خواناسییە. ئەو جەورو جەفای ژیان و مەرگە هەر بۆ دۆزینەوەی ئەو تاقانەیە بووە، كە لەودا هاتنە وجوود و هەر لەویشدا فەنا دەبنەوە.**

*** زوڵم لە زوڵمەتە و زوڵمەت تاریكی. ئەگەر توانیت چرای رۆشنبە بۆ رەواندنەوەی. كە نەتتوانی، لە زوڵم و زوڵمەتەوە راكە، بەرەو ئەو لایەی ساو و رووناكە.**

* پرسی: مەرام چییە لەوەی خەڵكی وێنەی خۆیان لە جام دەگرن و بە گوڵمێخ لە پاڵ سەریان لە تاقی دیواری دەدەن و رۆژێ چەند جار لێی دەڕوانن؟ گوتی: بۆ ئەوەیە باشتر خۆیان ببینن و چاكتر خۆیان بناسن، تێبگەن و بزانن كە لەو دونیاش وەها بە تاقا هەڵدەواسرێن و پێیان دەڵێن: دە تەماشای خۆتان كەن، بزانن كە ئێوە چین و چ بوون و چیتان كردووە! ئەوە وێنەتان و كردەوەتان و پاداشت و سزا.

* رەنجت با بۆ ئەوە بێ كە دەستڕەنجی دەمێنێ. نەك بۆ ئەوەی كە لەگەڵ تیاچوونی دەست،

دەستڕەنجیش بڕوا. زۆر وەستاکار ئێسکیان بۆتەوە بە خاك، بەڵام بە دەستکار بوون بە پیاوچاك.

* ئەگەر شێر و چەقەڵ و مرۆڤ گۆشتی ناسکی ئاسکیان نەخواردبا، ئەمڕۆ ئاسك هێند زۆر دەبوون، ئەگەر شێر و چەقەڵ و مرۆڤیان دەبەر پێیان نەبردبان، ئەوا بەبۆنی میسك گێژ و خوماریان دەکردن و دەفەوتان.

* هەرکەسە تەمای بە باری خۆیە خێری بۆ بدا. چ مەعلووم خێر دەدا یان زەڕ؟! دایك ئەو بارە قورسەی نۆ مانگ و نۆ رۆژ، دوو ساڵ و دەساڵو

**بیست ساڵی هەڵگرتووە و ئێشکی لێ گرتووە، تەمای پێیە سێبەرێك بێ پێی وەحەسێ. بەچی دیارە ئەو بارە قورسە، ئێسك سووکە یان ڕەزا قورسە! بە چ مەعلووم کە فێر دەبێ و بەخێر دەبێ! ئەگەر بشبێ، ترس و سۆزێ کە ئەم هەیبوو، ئەویش دەیبێ ؟!**

*** دەپرسن: هێلکە لە مریشکەوەیە یان مریشك لە هێلکەیە ؟ کەچی ئەوەی کەڵەبابە، کەس دە کوولەکەی تەڕیش ناوی نابا. هەرچەند پێدەچێ ئەویان ئەربابە.**

* شــەڕو تەقــەللای پەیــدا کردنــی ..............................
رزق و ڕۆزییــە. هێنــدێک ســەرەی بــۆ ..............................
دادەنێن، هێندێک سەری بۆ دادەنێن. ..............................
هێندێک پێی لات دەبن، هێندێک پێی ..............................
قـەپات دەبـن. زۆر نەدیتکـە بـە دزی ..............................
دەچنە نێو ناوان. زۆر ناودار بە دزی ..............................
سەردەنێنەوە لە تاوان، کەچی بدەرو ..............................
ببــەر خۆیــان نـین. یــەکێ لەســەران ..............................
ڕۆزی دەنێـرێ، بـێ ئـەوەی کـە هـیچ ..............................
گیانێ ببوێرێ. ..............................

* پــیر تــا ســەر چــرا بــۆ موریــد ..............................
هـەڵناگرێ، ئـاخر ئـەویش رووگـەی ..............................
دڵـی هەیـە و ئاتـاج بـە نـووری ئـەوە. ..............................
بـەدوای روونـاکی ئـەودا دەڕواو لـە ..............................

موریدی خۆی تەرە دەبێ، تا خۆی دەبێتە هاوێنەی رووگەی.

* گەر ژاوەژاوی ژیانی رۆژانە پەستی کردی، شەوان خۆت بدە بەر تریفەی مانگ تا لە هی ئەمڕۆ هێورت بکاتەوە و بۆ هی سبەینێش گورجت بکاتەوە. بە تۆ نییە، شەو خەسڵەتی ئارامی هەیە و رۆژ خەسڵەتی تین و بزاو.

* لە پەنایەك تریقەی پێکەنین و خەنینەوەی کچێکت بیست توانجی تێمەگرە ئەی کوڕ، ئەوەی بۆخۆت زۆر شیرینە، بۆچی بۆ ئەو ناشیرینە؟! هەزار خەون و خەیاڵی

تـۆ لـەلای ئـەوە. جـا گـەر ئـەو چـوو،
تۆش لە گۆڕستان پاڵکەوە.

* عـەقڵ مـیرە، دڵ و زمـان وەزیـر و
گزیـر، گـەر ئـەم دووە لـە میریـان
هەڵگەڕانـەوە سـەری ئـەو مـیرە بـە
فەتـەڕات دەبـەن و خۆشـیان پـارە
پـارە. بۆیەشـە مـیر تـا ئۆخەیـەك
دەکات، سەد ئاخ و ئۆف !

* هەموو شتێك ناوێکی هەیە و هـەم
ناونیشان. کێل بۆ ئەوەیە کە بزانی
ئـەوە گـۆڕەو نووسـینی سـەرکێل بـۆ
ئەوەیـە کـە بزانـی هـی زاتـی فلانـە،
بـەڵام غـەرەز و ئەسڵی مەبەست ئـەو

**فلانەیـــە. ئـــەوانی دی ئـــامرازی دیتنەوەی هەر ئەو فلانەن.**

*** هەرکەسـێ ئـارامی گـرت، ئاکـامی گـرت. هەرکەسـێ قـوڵ بـبڕێ قـوڵی دەبـڕێ و ئـەو کەسـەی تێـری خـەتا بوو، تـەرکی عـەتا بوو. هەرکەسیش بــە ئـــەمری هـــەق دەرکـــەوێ، سەردەکەوێ.**

*** شـنەبای ژیـن هەڵـدەکا و دەڵێـی: ئۆخـــەی ئـــەوە تاڵـــەمووی رۆحـــم دەبزوێنـێ. هێنـدە نابا کـە هاییـت لێ نییـە و ئـەو تاڵـەمووەت دەپسـێنێ. دەڵێن: زریان هەڵبکا کانیاو دەزێن و ئاو هەڵدەقوڵێنێ. زریانی ئەجەل کە**

**هەڵیکرد، ئاوی حەیاتیٚ وشك و چك دەکا و دوایی پیٚ دیٚنیٚ.**

*** ئەوەی گیرۆدەی دەردی عیشق بیٚ نیازی بەهیچ چارەیەك نییە. چارەی ئەو هەر ئەوەیە بە دەردی عیشق بتلێتەوە تا دەتویێتەوە.**

*** پرسی: داخۆ وادەبیٚ ناوێك بەناوبانگ ببیٚ بەبیٚ ناوبانگ ؟ گوتی: ئەوە مەگەر ناوبانگێك ئەو ناوەی داگرتبیٚ و ئەو ناوە ناوبانگێکی هەڵگرتبیٚ. وەك چۆن ناوی دەرکرد ئەو دەشتەی کەربەلا، چون بەخوێنی حوسێن و یارانی سوور کرا. ناوی دەرکرد ئەو**

دەشتەی عەرعەر، چون رۆڵەی
کوردی تێدا زیندەبەگۆڕ کران.

* سەختتر لەوە کە پشتگیری
باوەکوشتەت بکەی گەر لەسەر حەق
بوو، پشتگیری باوو براتە ئەگەر
ناحەقن.

* تۆ جەماڵی گەر کەماڵی. بێ
کەماڵی، جەماڵی هەر دەمێکە دێت و
دەڕوا. پرسی: کێ زاتی هەیە وەك
زاتی ئەو پێیوابێ جەماڵ و کەماڵە؟
گوتی: ئەوانەی لە زاتی ئەودا
دەتوێنەوە روو بە کەماڵن و لە
نووری ئەودا جەماڵن.

*** دڵـم وەك بـەهار پـڕ لـە کـرووك و سـەرم وەك شـانەی هـەنگ پـڕ لـە رەواقـە و رۆحـم وەك دەریـا پـڕ مرواریيە. بۆيە بينـاييم هێشتا وەك لاوی جـوانی دەبينـێ و تەمـەنم وەك شـەو سـەدان ئەسـتێرەی تـێ دەجريوێنێ .**

*** کە تـەوقی لەعنـەت کەوتـە گـەردن، ئەگەر گەردن تەوقەکە نەپسێنێ ئەوا ئەو گەردن لە رەگـەوە هەڵدەتـەکێنێ. هەرکەسێ سەرکەوت بەسـەر نەفسـی ئـەمماره گـەردنی خـۆی ئـازاد کـرد. ئـەوەيش وەك بەنـد لـەبن بەنـدی تەوقەکـەدا مايـەوە، تـا هەتايـە تلايەوە.**

* هـەتا سـەر سـەرداری لەشـە لێـی دەخـــوازرێ رەنـــج و دەســـترەنج دەخـوازێ. ئەگـەر سـەر چـوو، هـەزار ئاوات و سەوداش دەچنە ژێر گڵ.

* کـاتێ لـە سـەرما دار و چـیلکە دێنی و ئاگر هەڵدەکەی، پەسنی گڕو تینەکـەی دەکـەی، چـونکە ئـەوە گـەرمت دەکاتـەوەو چـیلکە و دار و ژیلـەمۆت بـە خـەیاڵ دانایـەن. لـە شۆڕشیشـــــیدا هـــــەر وایـــــە، دەسکەوتەکان دەبن بە خەنەبەندان و بـــاس هـــەر باســـی ئەوانـــە. قوربانیـــەکانیش وەك دەستەچـــیلە لـــــەنێو ژیلـــــەمۆی مێـــــژوو دادەمرکێنەوە.

* ئەوەی کە بێستوونی کون کرد نە قوڵنگ بوو نە بازووی فەرهاد، بەڵکو گرەو بوو. گرەو لەسەر عیشقی شیرین.

* دەڵێن خدر ئاوی حەیاتی نۆشیوە بۆیە لەگەڕان ناکەوێ. چ زەحمەتی و دەردەسەری!! ئەگەر ئاوی کەوسەری نۆشیبا قەت رازی دەبوو دەناو ئەو جەنگەڵستانە ئەو زەحمەتییە بگرێتەبەر و هەر بێت و بڕوا، داخۆ بەفریای لێقەوماوێك دەگات یان نا؟!

* دیکتاتۆر لە بەرامبەر رەعیەتەکەی شمشێری بریسکەداری بەهەوادا

رادەوەشـاند. کـە دەیـدیت رەعیـەت
دەســــتەکانیان بـــەرز دەکــــردەوە،
وایـــدەزانی بــۆ ستایشـــی ئــەوە.
بێخەبــەر لــەوەی کــە ئــەوان لــەبن
دەســــتەکاندا ســــەری خۆیـــــان
وێکهێنابووەوە، نەبادا بەو شمشێرە
بریسکەدارە سەریان بپەڕێ.

* نەققاڕێك چەکوشی هەڵێنایە سەر
بـەردێك نـەققاڕی بکـات، بـەرد لێـی
هاتە زمان: لەهەردوو دیومدا شوێنێ
پڕ بەسـەرت هەڵکۆڵـە. لێـرە لـەجێی
ســەرین ســەرم وێدەکــەی تــا بــە
ئیسـراحەت بخـەوی. لـەوێ کـە بـە
ئیسراحەت خەوتی بەسەر سەرتەوە
رادەنرێم.

* پەروانە بۆیە خۆی لە گڕی شەم دەدا تا عیشقی پیرۆزی ئەوی بەرکەوێ. زێڕ بۆیە بە ئاگر داغ دەکرێ تا مەعدەنی ساغی دەرکەوێ. ئەم دەسووتێ بۆ ئەوەی لەودا فەنا بێ. ئەو داغ دەبێ بۆ ئەوەی هەر خۆی بەقا بێ.

* ئەگەر ژیلەمۆت بینی حوکم لەسەر دامرکانی پۆڵوەکانی ناوی مەدە تا کزەبایەك هەڵنەکات. ئەودەم دەردەکەوێ کە خامۆشە یان هێشتا مەیل و سەودای لە جۆشە!.

* هەر شتە ئەوەی لێ دێ کە بۆی سازاوە. خەتای دێو نییە ناحەزە و

پەری مەحبووب! هونەر بۆ بولبول ....................................
نییە خۆشخوێنە و کوندەبۆ شووم! ....................................
گورگ چ بکا کە دڕندەیە و مەڕ چی ....................................
لەدەست دێ کە بەستەزمانە ؟! بەڵام ....................................
ئێمە جیاین ئەی لاوی گورج و هەی ....................................
پیری داماو، هۆش و ئاوەزە ....................................
دەربازمان دەکا لە سەد تەڵەو داو! ....................................

* ئەو شیر و داس و پێمەڕەی ....................................
دەیانبینی لە ئەزەلەوە تیژ و بڕەر ....................................
نین. جەوهەری تیژی و بڕەندەیی ....................................
ئەوان هی داغ و کوتانە. ....................................

* منداڵێك عانەیەكی لە باوكی ....................................
وەرگرت و بە هەڵبەز هەڵبەز ڕێی لای ....................................
عەتاری گرتەبەر شتێكی پێ بكڕێ، ....................................

**کە دەستی دە بنی گیرفانێ راکرد لە غارێدا عانەکەی لێ کەوتبوو. ئیدی کە تۆ سەربوردەی ئەو منداڵەت بیست، هێدی بڕۆ بەڕێدا و هەڵمەبەزە، دەنا ئەو نوور و رەونەقەت وەك عانەکە هەڵدەوەرێ و مایەپووچ دەمێنیەوە.**

*** هیوا لە کەس مەبڕە گەر هیوادار بوو. وەك چۆن بۆخۆت هیوای ژیانت هەیە، رێی هیوای ژیان لەویش دامەخە. ئەگەر تۆ ئەمڕۆ بە هیوای مەستیی لێرە شەڕاب دەنۆشی، لۆمەی ئەو مەکە کە بەتەمای مەستیی شەڕابی سبەیە.**

* بۆ وەرینی بەری دارە کە دار دەدەنە بەر بەردان، داری زڕیش بۆ کاریتە دەبڕنەوە. ئەگەر خەڵك کەوتنە سەرکۆنەی میری خۆیان، باشوایە میر ناز و نیعمەتیان بەسەردا بباریێنیٚ وەك بەری دار.

* کە دەنکەکانی تەسبێحی لە دەستی دەهێنا و دەبرد تێیوەڕامابووم. دیتم دەنکەکان هەر بەدەوری ئیمامیانەوە دەخولانەوە. ئێمە هەرچەندەی بخولێینەوە هەر سەر دەبەینەوە بەر قاپی ئەو. ڕێك وەك دەنکە تەسبێحەکان، هەرچەندەی دەخولانەوە هەر سەریان دەبردەوە لای ئیمام.

* ئەگـەر سەرپشـکی کـردی لـەنێوان
پێبەخشـــین و بەخشـــین، مـــەردی
خودابە بەخشـینت بویٚ. پێبەخشین
بەبیٚ بەخشین عەینی سزایە و ئازارو
دەرد.

* بـەو کەوانـەی دە دەسـتت دایـە
تیرێك بدەی لەخۆت، هـەرگیز ئازاری
وەك ئـەو تـیرە نـابیٚ کـە بـە هـەمان
کـەوان لـە کەسـێکی تـری دەدەی.
ئەوەی خۆت ئۆفی لەگەڵدایە و هی
ئـەو ئۆخـەی، کـە هـی خـۆت بـۆ
تاقیکردنـەوە بـووبیٚ و هـی ئـەو بـۆ
پێکان.

* چیا بڵندە، سارا پانە، دەریا قووڵ‌و ئاسمانیش دوور. بۆ سەرکەوتن بە چیا، شاخەوان. بۆ ڕێدەرکردن لە سارا، خۆشڕەوت‌و بۆ پەڕینەوە لە دەریا، مەلەوانی دەوێ. ئەمما بۆ ئەو ئاسمانی دوور، ڕۆحی پاک‌و سافی وەک نوور.

* ئەو وتارخوێنەی دەڵێ: بە قسەم بکە و بە عەمەلم نا، قسەکانیشی وەک گوێزی کوێرک پووچ و بێ کەڵکن، چونکە کردار هاوێنەی گوفتارە.

* هاوسەرێکی باشت هەبێ، ماڵێکی باشت هەیە. ماڵێکی باش

گونـــدێکی خنجیلانەیـــە. گونـــدێکی خنجیلانەت هەبێ، شارێکی رازاوەت دەبــێ. شــاری رازاوە، وڵاتێکــی بــە پیتە و وڵاتێکی بە پیت و بەرەکەت، ســــەرزەمینێکی پــــان و بەرینــــە. سـەرزەمینی پان و بـەرینیش هـەمان ئـەو هاوسـەرە باشـەیە کـە تـۆ هەتـە. دەسا لێت پیرۆز بێ و ئەو گەنجینەی بەختەوەرییە قەت مەڕەنجێنە.

* هـیچ شـتێك وەك عەدالـەت ژیـان ئاسوودە ناکات، بـەڵام ئـەو عەدالەتـە عومەرێکی دەوێ ئاوێنەی خودا بێ.

* ئەمەکناسـبە لـە حـەنا هـەر کـێ فـەزڵێکی هەیـە بەسـەرتەوە، چ پێـت

**عەتا بووبێ لە گەورەی بان سەران، چ دیاری بێ لە دەستی پیر و سەروەران، چ لوتفێك بێ لە دۆست و ئەحباب و دڵبەران. كە تۆ شایان بە فەزڵی فازڵانی، هەتا ماوی دەبێ قەدریان بزانی.**

*** كەسێ كە تامی هەنگوینی بە زاری تاڵە، لەبەر ئەوە نییە هەنگوین تاڵە، حاشا سەد حاشا. بەڵكە ئەوە كەسەكەیە تای لێیە و فێدار. ژیان ئەگەر ئەو هەنگوینە بێ كە بە زاران تاڵ و تفتە، عیللەت لە من و تۆیە كە تادارین، نەك لە هەلاڵەی بۆندار و شانەی زەرد و هەنگی چوست و چالاك.**

* پاشایەك گومبەزی بە کەللە سەری پڕژاو هەڵدەچنی و مزگەوتی بە خشتی سوورکراوە. ئەمیانی لە پێناو خۆی دەکردو ئەویانی بۆ خودا دەکردە پێناو. بەڵام نە خودا ئاتاج بە پێناوی ئەو بوو، نە توانی کەللەسەری خۆی دوور بگرێ لە چوونە سەر گومبەز.

* بەقەد گوناهبار هەست بە گوناه دەکەم، کە دەبینم نەدارێکی رووتەڵەی بێ مەفەر، دەست پاندەکاتەوە و دەکرووزێتەوە و شل و مل توورەگەی دەرۆزەی کردۆتە شان و مل. منیش پۆشتە و پەرداخ و بەرزە دەماخ !!

* مـرۆڤ کەرامـەتی نەڕووشـێنرێ، لەوپەڕی دەستلایەزییش دابێ مەرگ نـاحوبێنێ. لـە ئـەوجی هێـز و دەسـەلأتیش دابـێ گـەر کەرامـەتی رووشا، بێز لە ژیان دەکاتەوە.

* دیـن و دونیـا بۆیـە وەك دووانـە پێکـەوە هـاتوون، تـا کـاری دژواری ئەو بە ئاکاری ساکاری ئەم مەیسەر بـێ. دەنـا لـەودیو هـەر چـنینەوەی بـەری رەنجـە و حسـێب و کتـێب. نـە ئـەو ئەگەڕێتـەوە هەمدیسان، نـە ئـەم ئەدرێتەوە دەست ئینسان.

* رۆژ هەرچەندە ڕووناک بێ و تیشکی تاو چەندە پرشنگدار، بۆ نابینا هەر شەوی دەیجوورە.

* پرسی: چ بەوانە دەڵێی کە دەنگیان خۆشە؟ گوتم: چ لەوە چاکتر! پەروەرێنم دەنگی خۆشی پێ خۆشە و ناخۆش، ناخۆش. جوانی پێ جوانە و دزێو، دزێو. چاکی پێ چاکە و خراپ، خراپ. هەرچی خۆشە لەوەوەیە، هەرچی جوانە، هەرچی چاکە لەوەوەیە و ئەی جوانی دەنگخۆش چاکە بکە و تێبچریکێنە.

* ئەگەرچی کراسەکەی یوسفی خوێناوی کرد، بەڵام چونکە ددانی نەبوو ئەو گورگە نەیتوانی یوسف بخوا. گورگی بێ ددان لە لووره لوور بترازێ چی لە دەست هات ؟!

* پرسی: کێن ئەوانەی کە زۆر وەیەك دەچن و زۆر لەیەك جیا ؟ گوتی: ئەو دووە. ئەوەی کە یەکەمجارە دێت و ئەوەی کە بۆ دواجارە دەڕوات. ئەمیان کە دێت لە جاوێکی سپی دەپێچرێت و لە بێشکەی بە دەسترازا لینگی درێژ دەکرێ. ئەویان کە دواجارە دەڕوات، لە خامێکی سپی دەپێچرێت و لە دارەبازا لینگی درێژ دەکرێ. ئەم کە

دێت کەسانی دەوروبەری بۆی پێدەکەنن، ئەو کە دەڕوا کەسانی دەوروبەری بۆی دەگرین. ئەمیان کە هات هەواڵێکی لێرە نەبوو، ئەویان کە رۆیشت سۆراخێکی لەوێ نییە.

* لەسەر نەکردنی تاوانێك حوکم بدرێی زۆر ئەهوەنترە وەك لەوەی لەسەر کردنی تاوانێك چاوپۆشی و پاداشت.

* سەر هەوای تێدایە و هەزار هیوا. هەر ئەو هەوایە نەبووایە هیواکان زوو چرۆیان دەکرد. ئەگەرچی چرۆکانیش پێویستیان بە هەوا هەس، بەڵام عیللەتی هەوا کەم نین،

وشـككردنو هــەڵوەرينی چــرۆكانی ..........................................
هيــوا عيللــەتی هــەوان. كــه چــرۆی ..........................................
هيواكـــانيش هـــەڵوەرا، چ فايدەيـــه ..........................................
هەوای سەر؟! ..........................................

* لەهــەر دەور و زەمــانێ كــه تانــه ..........................................
دەدەن لــه پێشــەوايان، لــه دانايــان، ..........................................
هــەتا لــه ســنعەتكارو پيشــەوەران، ..........................................
ئيرەييان پێ دەبەن ئەوانەی گەمژەو ..........................................
نەزان و بێ ئيشن، دەنا مێروولـه بۆ ..........................................
هەڵدەگــەڕێ بــە لووتكــەی شـــاخ و ..........................................
كۆسه چی داوه له ريشن ؟*[٢]. ..........................................

---

٢- ئاماژەيه بۆ(خزمينه مەدەن پەنجه لەگەڵ عەشرەتی جافا..مێرووله نەچێ چاكه بەگژ قوللەيی قافا)
شيعری شێخ رەزای تاڵەبانی

* زەردەخەنەیەکی جوانم دیت و حەیفە کە تۆش نەیبینی. کەسێك هەڵەیەکی دەرهەق کرد، ئەم لە جیاتی لۆمە و سەرزەنشت کردن بیانووی بێنیازی بۆ هێنایەوە، بۆ ئەوەی بە هێوری ڕێگا ڕاستەکەی بۆ تەخت بکات. دوای دوو ڕۆژ کابرا داوای بەخشینی لێکرد. ئەم زەردەخەنەیەکی بۆ کرد و هەر ئەو زەردەخەنەیە دەڵێم و تۆش بیبینە.

*چاو چ ڕەش بێ و چ شین بێ و چ کاڵ، بەفر هەر بە سپی دەبینێ. گرنگ بینایی گلێنەیە نەك ڕەنگی گۆی چاو. زۆر کەس گۆی چاوی روون و جوانە بەڵام نابینێ، ئاخر

گلێنەی بێ بینایی کوێرە، هەرچەندە جوان و رەنگاڵە بێت.

* بە بەردەمی نەخۆشخانەیەکدا رەت بووین و دیتمان تەرمی لاوێکیان هێنایە دەرێ. راستی فەرموو باپیرەم کە گوتی: مردن کارەساتێکی گەورەیە! هەروا رامابووین کە پیرێکیان بە سواری عەرەبانەیەکەوە وەژووریَ نا، نە هەستی هەبوو نە خوست. بێ ئەوەی زمان هەڵبڕم بە زمانی دڵ بە باپیرەم پێمگوت: بەڵێ مردن کارەساتێکی تاڵ و گەورەیە ئەمما بێ حیکمەت نییە، هەر ئەو مردنە عەینی دەوایە بۆ هەزار دەرد.

ئەگـەر ژیـان حیکمـەتێکی هەیـە،
ئەرخەیانبە مردن بێ حیکمەت نییە.

* ئەگـەر بـە حەسـرەتی دیـداری
حەزرەتی ڕێی مەدینە ناتگەیەنێتە
ئەو، دەبێ حەوت ئاسمان بەرەو
ژوور ببڕی، هێشتاش چ مەعلووم
حاسڵمرادی!

* ئەم نەخۆشە نەخۆشی دیکەی
هەیە، ئەگەر پزیشك فلان و فیساری
لێ مەنع بکات، دەیکات. بەڵام
پزیشکی زانا بە هەموو دەردان کە
ئەم و ئەوی لێ مەنع کردووە گوێی
پێ نادات. بێشك ئەم نەخۆشە
نەخۆشی دیکەی هەیە و ئەو

پزیشــکە هەرچــییەکی بــۆ دابنــێ
عەقڵی پێ ناشکێ.

* ئەگــەر رووتەڵەیــەکت دیــت شــڕە
بزگــوڕێکی دەبــەردا، مەپرســە بــۆ وا
رووت و رەجاڵی؟ ئەوە نییە دەیبینی
رووتو رەجاڵــە ؟! چ پێویســت بــەو
تــیراوی پرسـیارە ؟ ئەگــەر هــەیبا لــە
بوخچــەدا قــەدی نــەدەکرد و ئێســتا
وەك تۆ بە پۆشتەیی خۆی بادەدا.

* مرۆگەل وەك تەلەکانی ساز و عـود
هەریەکــەی دەنگێکیــان لێــوە دێ،
بــەڵام ئەوکاتــەی هــەموویان پێکــەوە
لەدەسـتی ژەنیـارا رادەژێن، ئاوازێك

پێکـدێنن سـەدای زوڵاڵـی دەگاتـە
کەشکەڵانی دوور.

* ئەگەر نائومێدیی رووی تێکردی،
هێـزێ بێنـەوە بـەر خـۆت و بێنـەوە
یادت کە دوای چەند ساڵێك دابڕان،
یوسـف شـاد بۆتـەوە بـە ئـەهلی
کـەنعان. تـۆش لـە قـووڵایی بـیری
نائومێـدی، هەسـتەوە و هەڵێنـە
هەنگاو هێدی هێدی.

* پرسی: یاسین بۆ سێبەری نەبوو؟
گوتی: چونکە هەموو سێبەری ئەو
بوون و ئەو سێبەری تاقانە. هەموو
سێبەرەکان لەودا مەحوو بوونەوە و

ئەو لە سێبەری تاقانەدا مەحوو بووەوە.

* جوبران، برای بە چیا و خوشکی بە دەریا دانا. گوتی: ئەمیان وەك چیا بەهێزو رك‌و سەرسەختە، ئەویش وەك دەریا قووڵ‌و ساف‌و پڕ ئەوین. بەڵام ناوی هەورو بارانی نەهێنا، کە وەك باوك و دایك، ئەم ئەگرمێنیٚ و ئەو دائەکاتە بارین، تا چیا پڕ دەکەنەوە لە هێزی سەوز و دەریا پڕ دەکەنەوە لە ئەوینی شین*[٣].

---

٣- لە کتێبی (پەیامبەر و دێوانە). جوبران خەلیل جوبران

* ئەگەر بووی بە مایەی سەرئێشە بۆ خەڵك، بزانە كە بەسەرتەوە ناچێ!! دەبێ تۆش بە قیژەی جاڕسكەرێك ئەو ژانەسەرە بتگرێ.

* هیچ مەخلۆقێ وەك هەنگ نرخی گوڵ نازانێ، نە باغەوان و نە دڵدار و نە شاعیر و نە عەترفرۆش. ئەگەر بڵێی چۆن ؟ هەر ئەو هەنگوینە زەردو شیرینە پێتدەڵێ: تامكەو بمنۆش.

* گومان هەرچەندە هیچ لە هەقیقەت كەم و زیاد ناكات، بەڵام هەورێكە بەری چاو و دڵان دەگرێ، بەوەی باشە بەڵگە دەیرەوێنێتەوە. ئەگەر

گومانێــک دڵەخورپــەی پێگرتــی، ...................................
بەڵگـەی دروسـتی بـۆ پەیداکـە تـا ...................................
دائەمرکیٚ، ئەرخەیانیشبە هەقیقەت ...................................
باکی پیٚ نییە. ...................................

* شـاری دڵـم وەك شـارەکەی سـوارە ...................................
بـــاغ و گوڵســـتانە، کەچـــی ئـــەو ...................................
بولبولـــەی بـــۆی هـــەڵوەدام تێـــی ...................................
بچـریکێنیٚ، لــە بـاغێکی رازاوەتـر ...................................
مەست و گیرۆدەیە *[٤]. ...................................

* ئەگــەر لەناوتانــدا کەســێکی بــە ...................................
هەیبەت و شکۆ هەڵکەوت، هەر لەبەر ...................................
ئەوەی لـە کەلێنێکدا تـۆی وەبەرچاو ...................................
نەکـەوتووەو داخوازییەکـەی بـەجیٚ ...................................

---

٤– ئاماژە بۆ شیعری (شار– لە دیوانی زەمزەمەی زوڵاڵ) ی سوارەی ئێلیخانیزادە

نـەهێناوی مەیبوغزێنـە، رەنگـە هـەر
ئەو دوژمنەکانتی تاساندبێ.

* هەرچەندە ستایشی پـەری کـرا کـە
بـە چاوتروکانێ عەرشـی بەلقیسـای
لـە سـەبەئەوە بـۆ سـولێمان هێنـا، لـە
راسـتیدا هونـەر بـۆ هـود هـود بـوو،
گەرچـی لـەو دابڕانـەدا خـەریك بـوو
سەرکۆنە بکرێ.

* وا باشــە مــرۆڤ بــیر لــە تۆڵــە
نەکاتـەوە. هـەر کردیشی، بـەر لەهـەر
کــەس بــا نەفســی خــۆی راو بنــێ،
چـونکە نەفسـی خـۆی هەمیشـە وەك
دوژمن سەنگەری لێ گرتووە.

* میوه هەرچەندە بەسەر لکی بەرزی دارەوە بێ، تا نەگا ناوەرێ. مەمکی ژنی سکپڕ هەرچەندە خڕ و گۆشتن بێ تا نەزێ شیری تێ نازێ. خۆر هەرچەندە لە زەوی گەورەترە تا لە کەل دەمدیوە نەکەوێ دەرناکەوێ.

* کەسێك چاوی کز بێ ئاتاج بە چاویلکە دەبێ و هەم بە گۆچان، بەلام پێتوانەبێ هیوابڕاو بێ. گۆچانی بۆ ئەوەیە بەرەو ئەولا پێی بڕوا و چاویلکەی بۆ ئەوەیە ئەولا ببینێ کە هیوای پێیە .

* ئامازەکان خۆیان دەدوێن. کە مانگ دەرکەوت حەوجە بە

ئەنگوستیٚ نییە و کاتیٚ کرووک سەر
لە زەوی دێننە دەریٚ وا بەهارە و
هەرکە تیشکی هەتاوت دی دەزانی
شەو رابردووە و رۆژ دەرووی خۆی
کردۆتەوە. هەر کاتێکیش بەدوای
دارەبازێکدا چوویە سەر قەبران،
لەبیرت نەچیٚ کە کفنی تۆش بەڕادان
دراوە و دواجار هەر ئەو مەڵبەندە
خامۆشە، وەك ئەو جێی تۆشە.

* کابرایەك زۆری خۆ پەسنی و
شوولی بۆ شەڕ هەڵدەکێشا. کە شەڕ
قەوما خۆزگەی دەخواست دەوڕۆژە
رەشەی نەکەوتبا. کەس لە
دەباغخانە بۆنی گوڵاویٚ ناکا، لەویٚ

بـۆن هــەر بـۆنی پێســتەی گــەنیو و ترشاوە.

* سێبەر کە وەك تارمایی مەرگ هەر بەدوامانەوەیە، هی تۆ چ رەنگێکە و هـی مـن چ رەنگـێ ؟! هەرچـەندە کـە رەنگی مـن و تـۆ جیـابێ، سـێبەرمان یــەك رەنگــە. لەگــەڵ هەنــدێش تــۆ بــەیاری خــۆت هەڵــدەڵێی و مــن بــە یاری خۆم.

* تــا ئێــوارێ تــۆ بڵێــی کــەرەکێوی رەشە و خەتی سپی تێدان، مـن بڵـێم ســپییە و خـــەتی رەشـــی تێـــدان دەگەینــە کــوێ ؟! چ دەبـــێ ئەگـــەر رێکبکـەوین و بڵـێین ئـەو تێکەڵەیەکە

**لـــە رەش و ســـپی؟ تـــۆ چ زەرەرێ دەکەی و من چ زەرەرێ؟!**

*** مامۆســتاکەمان بــە دارحــەیزەران لێی دەدایـن و دەرسـی دەدایـن. ئەمما بە حەق دەرسیشی پێدەدایـن. بۆیـە تێگەیشـتین و پێگەیشـتین. هەنـدێ چاکە هەیە بە زەبرە و زۆر خراپـەش هەیــە دەبــێ بــە نــەرمی بــەری پــێ بگـری، تـا ناچـار بـی مـل بـۆ ئـەمیان بــدەیو مەیلیشــت لــە ئــەویان بــەر بدەی.**

*** ئەوین گەر حەقیقی بێت تا پیر بێ باشــتر. نــە دەمــرێ و نــە دەبــڕێ. عیشـقی مـەجازی هەرچـەندە گـوڕ و**

تینی لاویشی هەبێ، هەرگا عاشق
تل بێتەوە، بیر دەچێتەوە.

* ئەو کراسە سپییە ئوتووکراوەی
ساڵەهایە دەیکەینە بەرمان، بۆ ئەوە
هونەر لە پەشمین و چنینیدا بە زایە
نەدراوە کە دڵێکی رەشداگەڕاو بە
رق و کینە داپۆشێ!

* ئیرادەی خۆتە کە دەستباریی
بکەی یان دەستبڕی. گەر بتەوێ ئەو
ئیرادەیەت مرۆدۆستانەبێ، خۆت
بخە شوێن ئەوەی بەرامبەرتە، چی
لەو چاوەڕێ دەکەی، دەستباری یان
دەستبڕی؟!

* رەخش قابیلی رۆستەمە و راوچی داناش هەم رێوی راو دەکات و هەم ئاسک، چونکە لەمیان کەوڵی گەرەکەو لەویان گۆشت. سمۆرە لە کەسێکی نابەڵەد بخوازی جورجێکت بۆ دەهێنێت خڕ و خڕپن.

* گرەو لەسەر گەزی مار مەکە، چونکە ئەگەر ژەهرەکەیشی دەستبەجێ نەتکوژێ ئەوا بە قوربانی مردنت دەکا و تاڵاوێکت پێ دەنۆشێ و تیراوێکت پێ دەردەدا خۆزگە بخوازی بە مردن.

* شێتێك بە بازاڕدا داگەڕا، هەمووان خۆیان لێی لادا تا بەریان نەکەوێ

نەبادا جلەپیسەکانی پیسیان بکات.
کە لەوسەری بە بازاڕدا هەڵگەڕایەوە
خۆی لە هەمووان لادا بەری نەکەون،
نەبادا دڵەپیسەکانیان وەك خۆیان
پیسی بکەن.

* ئەو ژیانە ژانگرتووە تەمەنێکی
بێهوودە لێبردم، چونکە گیرۆدەی
چواردەورووبەرم. هەرگیز ناگەمە
ترۆپکی ئاوات، چونکە مەحکومی
دەستی قەدەرم.

* کۆترێکی سپی بەسەر چڵی
دارخۆخەکەی حەوشەی ماڵمان
هەڵنیشتەوە، بۆ چەند ساتێك
شریتی خەیاڵی پساندم. کە

گمماندی، هەیهات هەیهات!! دیتم
ئەوە رۆحی هەڵوەدای دایکمە
هاتۆتەوە تا تاسەی غوربەتیم
بشکێنێ. چون دەزانێ زۆر دەمێکە
رۆحم متووی ئەوە و تاسەی رەنگ و
دەنگ و رۆحی بێگەردی ئەو دەکات.

* ویژدان رێی دە گیرفان ناکەوێ،
مەگەر لە ژێر گیرفاندا دڵێکی
بەخشندەی گەورە شك ببات!

* ژەنگ عیللەتی خورانی کانزایە و
کەڕوو هی تێکچوونی نانە، نە ئەم بە
زاخاو ساغ دەبێتەوەو نە ئەو بە
شێلان. بەڵام ژەنگ و کەڕوو هۆکار
نین، ئەوان دەرەنجامی هۆکارەکانی

تێکچوونن، کە ژەنگی داوە لەمیان و کەڕووی داوە لەو.

* نە شەوبای سەحرایێ، نە نمەبارانی کەنار دەریایێ، نە شەماڵی سەر قۆپی چیایێ، نە خوناوەی سەر پەلکە گیایێ، هیچیان نیانە هێزی پڕ سیحری لایلایەی دایێ.

* هەرچی کە حەڕام کراوە بەهۆی حەڵاڵەوە بووە و غایەت لە حەڵاڵیش هەڵسانەوەیە. ئێمە کە لەو نزمایی زەمینە بەپشتدا کەوتووین، روومان لە ئاسمانی بڵندە و بۆ هەڵسانەوە ئاتاج بە حەڵاڵین و ئەویش بێ تەرکی حەڕامەوە نابێ.

* پرسـی: ئەگـەر بـەدەوری قـەڵای نهێنیدا بێم و بچم و دەرگای چوونە ژوورەوەم نـەبێ چـۆن پـەی بـە نهێنییـەکانی نێـوی ببـەم ؟ گـوتی: مەگـەر خـۆت بکـەی بـەو نهێنییـە گەورەیـەی کـە قەڵاکـە بەدواتـەوە دەرگاکـانی لـە رێسـمە هەڵتـەکێنێ و بەدواتدا بکەوێتە گرێوەغار. ئەوکات بە ئاسانی دەستت بە نهێنییەکانی رادەگات!

* مـرۆڤ گـیرۆدەی ویسـتی دڵ بێـت، نەوییـە. بـەڵام گیرۆدەبـوونی عـەقڵی سـەر، چـوونە سـەرە. بۆیـە ئـەو دڵـە وەك دونیـا کـە لـە ئەدنایە، هەندێکـە لـە هـەموو. وەلێ عـەقڵی سـەر

دەتباتەوە سەر و دەتگەیەنێتەوە بە
هەموو، کە هەمووش بوو هەندەکەش
دەبێ.

* قەت لەگەڵ لێبوردەیی و بەخشین
دوودڵ مەبە، بەڵام نابێ ئەوەش
لەبیر بکەی ئەگەر سەری داگیرکاری
نیشتمانت لە بەرد نەدەی، چاوەڕێ
بە ئەو سەرت بدا لە دار.

* لە حزووری پیری دلا، دڵ
پڕخرۆش و زمان لاڵە. لەدووری ئەوا
دڵ وێڵە و سەرگەردان، زمانیش
دەکاتە ناڵە و فیغان. چونکە لە
حزووردا ئەدەب ڕێگەت لێ ئەگرێ و
لە دووریدا عیشق ئۆقرەت لێ ئەبڕێ.

* ئەگەر سەگ بە کەسێك بوەڕێ، هەر لەوێدا ژیری و نەفامی کابرا دەردەکەون. ئەگەر بەردی تێگرت ئەو پەلاماری دەدا تا قەپاڵی لێبگرێ. ئەگەر نانێکی هەڵدایە بەرێ، ئەو کلکی بۆ دەکوتێ و ڕێی بۆ چۆل دەکا.

* پرسی: چی بەوە دەڵێی تا دارایە ئەوەی لەبیری ناچێتەوە گیرفانە، لە نەداریشا ڕوو لە یەزدانە. گوتی: لەمدا دیلی چرووکی خۆیە و لەودا عەودالی بەخشندەیی ئەو.

* زێڕ چ لەناو قووتووی زێڕینگەر چ لەناو خاکا کەوتبێ، یەك قرۆش

نرخـی ویـوەتر ناچیت. باق‌و بریقی ..............................
دوکـــان لەبــەر راکێشـــانی کڕیـــار و ..............................
سەفای فرۆشیارە نەك لەبەر ئەوەی ..............................
کە ئەم زێڕە درەوشاوەیە ساغ‌و بە ..............................
نــرختر بێــت لـــەوەی کـــە لـــەخاکا ..............................
رۆچووە. ..............................

* ماســـیگر کـــاتێ قـــولاپ داوێتـــە ..............................
رووبـار، ئەگـەر بـڕێ پێخـۆر نەخاتـە ..............................
ســـەر نووکەکـــەی، ماســـی دەم بـــە ..............................
ئاسـنی سـارد دا ناکـات. بـۆ کـەس ..............................
نییـــە بڵـــێ ماســـی نەفامـــە بۆیـــە بـــە ..............................
قولاپەوە دەبێ. ئەو لەناو پێچ و گەڕا ..............................
بـــەدوای قـــووتی خۆیـــدا دەگـــەڕێ‌و ..............................
فـامی ئـەو هـەر لەوەدایـە بـەدوای ..............................

قووتەوە بێ. فێڵی ماسیگریش هەر
بۆ ئەو قووتەیە.

* زولفەقار دەدەستی عەلی دابێ، با
لە کالانیشی دەرنەکێشابێ سامی
هەیە و دوژمن حسابی سەری خۆی
دەکات.

* بنی دەریا پڕە لە مرواری
گرانبەها، بەڵام شەپۆڵەکانی
مەترسیدارن و مەلەوان هەرچەند
هیوای هەبێ، دەبێ شارەزای
قووڵایی دەریا بێ. لەوسەر باری
مرواری چەندە جێی دڵخۆشییە،
هێشتا نابێ شەپۆڵەکان لەبیر بکات
تا دەگاتەوە کەنار.

* مەعشوقێ بە عاشقەکەی گوت:
لەو عیشقەی من، تۆ هەرچەندەی
بۆخۆت ببەیو کەمی بهێڵیەوە
بۆمن، من بەو کەمییە سەرتر دەبم.
جۆتیار قەدی مێوەکانی ڕەزی
دەبڕێ و کەمیان دەکاتەوە، تا
وەختی بەر ترێی زۆرتر بگرن.

* پرسی: پەروەردگار کە ئادەمی
کردە جێنشین، دوای ئادەم ئەو
هەموو ئەنبیایەو خاتەم لەبەر چی؟
گوتی: بەڵکو هەوڵەکان هەڵەکان
بسڕنەوە. بە هەڵەی ئادەم
کەوتووینەتە داو، بە هەوڵی خاتەم
لێی دەرباز ببین!

* تـــالاْوت بـــداتیْ دۆســـتیْ وەك دەرمـــانی دەرد، نـــەك هـــەنگوین وەرگری لەدەستی نامەرد.

* کەسیْ گـومڕابیْ و کەوتبێتـە نێـو تـاریکی، ئەگـەر بـە بینـایی دیـدەی چرا نـەبینیْ چۆن بە رووناکی چرا پـێش خـۆی ئـەبینیْ ؟! ئـەوەیش کـە خـەوتووە هـەزار کەسـی خـەوتووی لەدەورە بن، پێی وە ئاگا نایەن.

* ئــەوەی تــا لەســەر خاکدایــە و خاکەڕایــە، ئــەو رۆژەی دەخرێتــە توێی خاك هیچ دژوارییەك نابینیْ. دژواری بۆ ئەوە کە بە هـەوای بڵنـدی سـەر دوور رۆیشـتووە و لـە خـاك

**هەترە بووە. ئەو سەرەی کە هەر بای سەرانی هەڵمژیوە و بۆنی بە خاکدا نەکردووە، سەختە لەتوێی خاک مەیلی بای سەران بەربدا و بەبۆنی خاک رابێ و ئاسوودە و خاکەڕا بێ.**

*** وەلانێ خزم و ئەحبابی زەمانە، ئەگەر سیلە لەبۆ تەرکی ئیمانە. بگرە ئەوە کە ئاشنایە بەباری، هەرچەند کە غەوارە و نەناس دیاری.**

*** هەرگا ئاوەز کەوتە دوای نەفسی ناحەز ئەگەنێ و با لە پاتەی هەرە بڵندی سەریشا بێ، دوو پوولی قەڵپ ناهێنێ.**

* قوتابییەك لە مامۆستاكەی پرسی:
فیرعەون كێیە و كێیە موسا؟ گوتی:
ئەوەی دەیەویست خۆی لە وجوودی
خالّق بتوێنێتەوە موسایە و ئەوەی
بانگەشەی دەكرد خالّق لە وجوودی
ئەودا ماوەتەوە فیرعەون. ئەوە نییە
لاشەی موسا تواوەتەوە و كەس
نایبینیّ و هەی فیرعەونیش
لەبەرچاوان!! ئەو پەندە بۆ ئەوەیە
كە دەسەلاّتی خوا هەست پێبكەی،
دەنا كێ دۆستەكەی خۆی
لەبەرچاوان ون دەكات و دوژمنەكەی
دەهێلّێتەوە؟!

* ناحــەز شكســتت ببیســێ بــە زار بۆت دەكات چوك چوك چوك، سەد جار بە دڵیش دەڵێ ئۆخەی!

* كەسێك وەسیەت بكات كە مرد بیبەنــەوە فلانــە شــوێن بینێــژن، هۆشمەند ئەو كەسە كە هەر ئەو دەمەو تا زیندووە دەستی بگرێ و بیباتە ئەوێ تا غوربەتی بشكێنێ، دەنا كە مرد لاشەی ساردو سڕی بێگیان چ لێرە دە گڵەسوور رابكرێ و چ لەوێ دە گڵەزەرد، فەرقی چییە؟!

* هیچ باكت نەبێ لە پێشهات و لە داهاتوو. لە زەمەنی خۆت دا بژی،

چونکه هەر بارتەقای باری گرانی
زەمەنی خۆت دەبەی، ئەگەر بشبەی!

* بەفری قەندیل هەرچەندە ببارێ و
لەسەر یەك گرد و كۆ بێ، ئەگەر
نەتوێتەوە و ساردا‌وی نەڕواتە
پێدەشتەکان، جگە لە سنوور
بەستن و رێ بەندان سوودی نابێ.

* پشت نابەسترێ نە بە دۆستی
دۆستەکەت و نە بە دوژمنی
دوژمنەکەت، هەریەك لەمانە
لەسەروەختی بەرژەوەندیدان و
لەگەڵ نەمانی نامێنن.

* هەردووکی بە سامان کرد بە ناونیشان. قاڕوونی بە تونی نەفرەتا دابرد، حاتەمی بە دڵاوا ناودار کرد. ئەگەر گوتراوە چڵکی دەستە ماڵی دونیا، مسکە بۆ رەندان.

* بەدکارێ بەلای دەوارێ رەت بوو، سەگی دیت لەسەر رێ وەرکەوتبوو، رێی خۆی گۆڕی نەبا گڵاوی بکات. شێخی دەوارنشین ئەمەی دیت بزەی هاتێ و لەبەر خۆیەوە گوتی: چەند باش کە لایدا، نەبیزادەیەك زۆر لەخۆی کۆکتر وەبەر نەفرەت کەوت. سەگێکیش کە پاسی یارانی ئەشکەوتی کرد بە تەبەڕوك بوو.

* زۆر دڵخۆش مەبە بە مردنی کەس
کە هێشتا ئیزڕائیل هەر دێت و
دەڕوا. گەر ئاگر هەڵسا لە ماڵی
خەڵکی بگەرە فریای، کە خۆت ماڵت
هەس.

* ئەوەی بە هەوای سەری دەفڕێ،
وەك ئەو باڵۆنەیە کە بە با فوو
دراوەو لە بەرزەفڕیدا بە قامکی
دەست ئاماژەی بۆ دەکەن. ئەمما کە
لە بەرزایی بە تینێك تەقی، بە فشی
دێتەوە خوارێ و تەنانەت منداڵە
وردکەش ئاوڕی وەسەر نادەنەوە.

* مەردووم لە تەنیاییدا سەر و دڵیان
وێکدێتەوەو پەست و پەرێشان

دەکـــەون. عاشـــق نـــەبێ لـــە رازی ...................................
تـــەنیایی گەیشـــتووە و گەیشـــتۆتە ...................................
مەعشـوقی خـۆی. ئیـدی بـۆ ئـەو ...................................
هـەموو مـەردووم ئەمـە و ئـەم هـەموو ...................................
مەردوومە. ...................................

* دەریا چەند ساو بێ سێڵاو بێ یان ...................................
لێـــڵ، دوڕو مـــرواری هـــەر جـــوانی ...................................
جوانن. دیاربن یان رۆچوو لە قوڕ و ...................................
چـڵپاو، ئـــەوان هەمیشـــە ســـەنگین و ...................................
گرانن. ...................................

* گورگ ئەگەر خەوتانی ژەمی خۆی ...................................
نـەخوا، چ بخـوا ؟! گەرچـی مـەعلوم ...................................
نییـە ئـاخۆ شـوان وە کـەوڵی گـورگ ...................................
رائـــەگا، یـــان گـــورگ وە پەراســـووی ...................................

**مـــەڕ، یـــاخۆ مـــەڕ وە باقـــەگیای خوساوی بەرەبەیان!**

*** تای تەرازووی کێش تا گرانتر بێ دەچێتە خوارێ، چەشنی مرواری لە بنی دەریا.**

*** جۆتیـــار لـــە شـــۆڕەکات تـــۆو دابچـێنێ، مانــدووبوون کــە هــیچ، بنەتۆوەکـــەش ناهێنێتـــەوە. بـــۆ ئافـەرینێ چاکەیەك بکـەی، چـەندی تێچـــووە لەدەســـتت چـــووە و ناگەڕێتەوە.**

*** ئەو منـی عینـادە زۆری گـوت. ئـەم پێـی فـەرموو: خـۆت بناسـە و خـوات**

**بناسه. بزانه که "ئەو یەکه و ئەمن و ئەتۆ هیچ"*٥. ئەو خوری ئێمەی کردۆته ریس و دیسان ریسەکەمان تیسك تیسك دەکاتەوه خوری، چونکه ئەوه تاکی دانا. ئێمەش سست و بێ توانا.**

*** هەمدیسان سلاو.. پێشتر گوتوومەو ناڵێم ئەوانەی گوتوومن راست و پەسندن. تۆ ئەوەی پێت راست و پەسنده، وه گیانت کەوێ سەد جار، ئەوەش که قەڵپ و خواروخێچه سەر وه ساحێب.**

---

٥– ئاماژه بۆ کتێبی (یەك لەپاڵ خاڵ و سفری بێ برانەوه)، ن: دکتۆر عەلی شەریعەتی. و: هەژار موکریانی

# فەرهەنگۆك

**ئـ -**

**ئاتاج: موحتاج، چاو لە یارمەتی و دەستگیرۆیی**

**ئاوەز: هۆش**

**ئاوڕ: رووتێکردن، روانین بەرەو دواوە**

**ئەرباب: خاوەن**

**ئەرخەیان: دڵنیا، خاترجەم**

**ئەستری: ستری، دڕك، چقڵ**

**ئەسپایی: هێواشی، لەسەرەخۆ**

**ئەسپەشێ: ئەسپێك رەنگی سوورێکی سپی پات بێ**

**ئەستەم: سەخت، دژوار، زەحمەت**

**ئەمەکناس: وەفادار، چاکەی بەرامبەری وەبیر بێ**

**ئەندێشە: رامان**

**ئەهوار: زۆنگاو**

**ئەهوەنتر: ئاسانتر، ساناتر، سووکتر،**

**ئەوی دی: ئەوەی تر**

**ئەوج: چڵەپۆپە، لووتکە، ئەوپەڕ**

**ئێشك: نۆبەت، چاودێری و پاسەوانی**

**ئۆقرە: حەجمین، ئارامی**

**ئیرەیی: بەخیلی، حەسوودی، چاوچنۆکی**

**ب -**

**بارتەقا: بەقەد، بەقەرا، بەقەدەر، هەمبەر**

**بانگەشە: ئیدیعا، پڕوپاگەندە**

**بانگرۆز: گلاربوونەوە، تل بوونەوە، خلۆربوونەوە**

**بە پڕتاو: بەلەز، بە پەلە**

**بەتەنێ: بەتەنیا**

**بەرئاگردان: بەردەم کوچك و گۆڕکی ئاگر**

**بەرێ: پێشان، رابردوو**

**بەرۆك: یەخە، بەرسنگە، بەرچێر**

**بەری: بەریئ، ئەستۆپاکی**

**بەستێن: ئەو کەنار رووبار و ئاوانەی کە بەفر داپۆشیون**

**بەقای پێ مەکە: باوەڕی پێ مەکە، متمانەی پێ مەکە**

**بە گزی: بە فێڵ و درۆینە، بە حیلە**

بەلەز: بەخێرا، بەپەلە

بزاو: جووڵە، بزاڤ

بزە: خەندە

بزگوڕ: جل و بەرگی کۆن و دڕاو

بێشکە: لانکە

بێهوودە: بەخۆڕا، بە هەوەنتە

بێ پسانەوە: بێ پچڕان، بێ دابڕان

بێ مەفەر: بێ چارە، ناعیلاج

بێنەزیر: بێهاوتا، بێ وێنە

بێز: قێز، بێزوو، هێڵنجهەڵهێنان لە شت، دڵتێکهەڵهێنان لە شت

بێ مەفەر: بێچارە، ناعیلاج، بێ پەنا

بیرکۆڵ: کەمئەقڵ، گێلۆکە

بیانوو: بەهانە، هەنجەت

بنەبان: لە بنی بنەوە، لەدواوە

بنەتۆو: ئەو تۆوەی جوتیار دایدەچێنێ

پ -

پاتەسەر: بەشی پشتەوە لە کڵاوەی سەر

پارێز بردن: خۆ مەڵاسدان، بە دزی و هێواشی بۆ شتێك بچی

پاساو: بەڵگەهێنانەوە

پاس کردن: سەگ کە پاسەوانی دەکات، وەڕینی سە

پەرێز: کێڵگە و زەوییەك دوای هەڵگرتنەوەی دەغڵ و دان

پەست: هەراسان

پەسیرە: بەرسیلە، ترێی ترش و نەگەییو

پەسن: مەدح، سەنا، ستایش، پیاهەڵدان

پەشمین: رستن و کشت کردنی قوماش لە خوری

پەکی پێ ناکەوێ: پێی ماتەڵ نابێ، پێی گیرۆ نابێ

پەلەقاژە: هەوڵ و تەقەللای کاتی تەنگانە، ئاوزینگ

پەل: دەست و پێ

پەلار: چیلکەدارێك کە بهاوێژرێت

پلار: توانج، تەشەر، تانە کە دە کەسێك بگیرێ

پەی پێبردن: زەفەر پێبردن

پەیك: پەیامبەر، نامەبەر، راسپێردراو، تەتەر

پێکەوە: لەگەڵ یەکتر

پێکان: ئەنگاوتن، لەنیشانە دان

پۆشتە: رێکپۆش، کۆك

پۆڵوو: پەنگر، پشکۆ، سکڵ

پێمەڕە: وەك خاكەناز بۆ كێڵانی زەوی بەكاردێت بە پێ
خستنە سەریەوە
پێخۆر: خۆرش، ئەو خواردنانەی بە نانەوە دەخورێن، زیاتر بۆ
سپیایەتی و ژەمی بەیانیان بەكاردێت
پنت: خاڵ، دەنك، گەرد
ت -
تازەزاو: نەوزاد، مەلۆتكەی تازە لەدایك بوو
تاسە: حەز، هەوەست، ئارەزوو
تاو: هەتاو، خۆر
تاو پەڕی: هەتاو ئاوابوو، ڕۆژ ئاوابوو
تەبەڕوك: موتفەڕك، پیرۆز
تەریك بوون: پەنا بوون، هەڵبڕان، لاپەڕگە، دەكەلی بوون
تەلەسم: ئەفسوون، جادوو
تەرە دەبێ: هەڵدەبڕێ، نەبان دەبێ، جیادەبێتەوە
تەما: هیوا، ئومێد
تەوق: ئەڵقە، زنجیر
تەیدەكا: دەردەكا، دەیبڕێ، تێیدا دەگەڕێ
ترۆپك: لووتكە، دوند

تل: غلۆر، گلۆر، گلار، بانگرۆز، بکەوێتە سەر تەنیشت

تۆرەمە: وەزە وەزە، وەچە، بەر، نەسل

تووك: دوعای نابەجێ

توون: ئەو شوێنەی کە ئاگری لێ هەڵدەکرێ بۆ گەرمکردنی حەمام

تیژ هات: بەلەز هات، بەخێرایی هات

تێن: هێزو گوڕ (وزەی لەش)

تین: تاو (وزەی گەرمی و ڕووناکی)

تیراو: کێم و زوخاوە کە لە کولکێك دێت کە لەسەر ئێسك یان لە گەڕوو هاتووە

تیسك: داوە خورییەکی درێژ، لزگە مووەکی خوری درێژ

ج -

جاڕس: وەڕس، بێزار

جاو: خەزنە، ئەو قوماشە سپییەی کە مەلۆتکە یان مردووی تێوە دەپێچرێ

جۆخین: ئەو شوێنەی کە خەرمانی دانەوێڵەی لەسەر کۆدەکرێتەوە بۆ شەن و کەوکردن

چ -

چەشن: وەك، مینا

چرووك: رەزیل

چوست: چالاك، گورج و گۆڵ

ح -

حەوجە: پێویست پێبوون، ئاتاج پێبوون

خ -

خاترجەم: دڵ ئەرخەیان

خاس: باش، چاك

خەزێنە: گەنجینە

خەوش: خڵتە و عەیبە، کەموکوڕی

خەنەبەندان: ئامادەسازی بۆ ئاهەنگی شەوی بەر لە بردنی بووکێ

خەنینەوە: دڵخۆشبوون، تریقانەوە

خوساو: تەڕ بوو بە ئاو یان بە شەونمی بەرەبەیان و نەرم و شلك بوون

خوست: دەنگ، هەست و جووڵە

خومار: مەست

د -

**دارەباز:** دارەمەیت

**داگەڕا:** چووە خواریێ، بەرەوژێر بووەوە

**دامام:** کەوتمە مەڕاق و خەیاڵەوە، هێدمەم لێدا

**داوێی:** دەهاوێژی

**دەباغخانە:** ئەو شوێنەی کە پێستەی حەیوانی لێ خۆش دەکرێ

**دەبریسکێتەوە:** شەوق ئەداتەوە، ئەتریسکێتەوە

**دەبەرما:** لە قوڕگی گیربوو

**دەتاسێنێ:** مات و بێهۆشی دەکا، واقی وڕ دەکا

**دەربەست:** بەتەنگ شتێکەوە بوون، پەیوەست بوون

**دەروو:** دەرگا، دەریچە

**دەردان بپەڕێنی:** نەخۆشی بپەڕێنی و چاك ببیتەوە

**دەستبار:** دەستگیرۆیی، یارمەتیدان

**دەسترازە:** ئەو دەستبەندەی لە لانکە دەبەسترێ و منداڵی پێ توند دەکرێ

**دەستەپاچە:** بێ دەسەلأت، دەست و پێ سپی

**دەستەچیلە:** دەستێك چیلکەدار کە ئاگریان پێ بکرێتەوە

**دەستلایەز:** بێدەسەلأت

**دەستەمۆ: کەیی، رام، کەوی**

**دەشنێتەوە: دەلەرێتەوە**

**دەکەلی هاتن: ئاودیو بوون، لێ پەنابوون**

**دەوار: رەشماڵ**

**دەیجوور: شەوی تاریک و نووتەك**

**دەیحوبێنن: دەیانەوێ، مەیلیان بۆ هەیە، خۆشیاندەوێ**

**دەیسمێ: کونی دەکا، زۆر بە زراوی دەیبڕێ، دووبەدەری دەکا، بە ئاستەم بەری دەکەوێ**

**دژوار: سەخت، زەحمەت**

**دیقی کرد: سەکتە لێیدا**

**دێو: درنج، جۆرێك گیانەوەری ئەفسانەیی گەورەو زەبەللاحە**

**ر -**

**رامووسی: ماچ بکەی**

**ران: مێگەل**

**رەتاندیان: راوەدوویان نا**

**رەخش: ئەسپی رەسەن و بەرز، ناوی ئەسپەکەی رۆستەمیش بووە**

**رەشەن: ئەو شوێنەی کە بەفری لێ رەش بۆتەوە**

رەعیەت: رەشە خەڵك، مەردووم، عەوام

رەواقە: شیلەی چڕی هەنگوین

رەونەق: رەنگ و شەوق و بریقدانەوە

رتووش: مكیاژ

رۆین: رۆیشتن

رۆزی: قووتی ژیان

رووگە: قیبلە

رێسمە: گرێژەنە، ئەو شوێنەی كە دەرگای لەسەر دادەمەزرێ

ریس: خورییەك كە بە تەشی رێسترابێ

ز -

زاخاو: سەقاو

زایە: زایەع، بە خۆڕا، بە زەرەر

زەنگوڵەی ئارەقە: دڵۆپەی ئارەقە

زولفەقاڕ: شمشێری دوو نووكی ئیمام عەلی

زێڕكفت: بە رەنگی زەرد و زێڕین نەخشێنراو

زیوان: جۆرێك گیای تاڵە لەنێو دەغڵ و دان شین دەبێ

ژ -

ژاوەژاو: غەڵبەغەڵب، دەنگە دەنگ و هەراو هۆریا

**ژیار: ژیان، شارستانییەت**

**ژیلەمۆ: ئەو مشکییەی لەدوای دامرکانەوەی ئاگری بە داران دەمێنێتەوە**

**س -**

**ساتمە بردن: سەرنسکۆ بردن، سەرپەلۆ بردن، هەڵەنگوتن**

**ساو: ساف**

**سام: هەیبەت، بیم**

**سەبەئ: شارێکە لە یەمەن، لە قورئانی پیرۆز چیرۆکەکەی عەرشی بەلقیسا و حەزرەتی سولێمان لە سەبەئ باس کراوە**

**سەخی: دڵاوا، دەست کراوە**

**سەفا: دیمەنی جوان**

**سەراسیمەیی: سەرسوڕماوی، واقوڕماوی**

**سەراب: تراویلکە**

**سەرەخۆرە: مایەی تیاچوونی سەر**

**سەرپشك: موخەییەر**

**سەرکۆنە: سەرزەنشت**

**سەرمابردەڵە: سەرمابردوو**

**سەقەم: سەرمایەکی زۆری وشك**

سرك: گیانداری دەستەمۆ نەكراو كە بسڵەمێتەوە، ماڵی نەكراو

سێرە: نیشانە

سۆراخ: هەواڵ

سیلە: سیلەی رەحم و خۆشەویستی، پەیوەندی

سیمە: داوی رەنگاوڕەنگ

سێڵاو: لافاو، لێمشت

**ش –**

شاخدار: قۆچدار

شەكەت: ماندوو، هیلاك

شەوق: شۆق، رووناكی، بریقەدانەوەی شتەكان

شەن و كەو: بەربا كردنی خەرمانی گێرەكراو بۆ

سووركردنەوەی دان و جیاكردنەوەی لە كا و قەرسیل

شۆڕەكات: زەوییەكی وشك و برینگ و سوێر بێت و هیچی لێ

نەڕوێ

شوون: ئاسەوار، شوێنپێ

**ع–**

عیناد: منجڕ

**غ –**

**غەرەز:** مەبەست، بە رق هەڵگرتنیش دێت

**غەواره:** بێگانه، بیانی، غەریبه

**ف –**

**فام:** هۆش

**فەتەڕات:** گۆبەند

**فەراحنایی:** ئاسوودەیی

**فەڕ:** پیت و بەرەکەت

**فەریکە:** ئەو بەرەی کە ساوایەو پێنەگەییوە

**فێدار:** کەسێك فێ بگرێ، گەشکە بگرێ، پەرکەم بگرێ

**ق –**

**قابیل:** شایستە، شایان، ناوی یەکێك لەدوو کوڕەکەی حەزرەتی ئادەمیشە

**قامك:** ئەنگوست، پەنجە

**قەپاڵ:** حەپ لێگرتن، گەز لێگرتن

**قەره:** قاورمە، گۆشتی کوڵاو کە ساردبکرێتەوەو هەڵبگیرێ بۆ کاتی پێویست

**قەڵپ:** چرووك، بێنرخ

**قرێژ:** چڵك و پیساییەك کە بە بەدەنەوە دەلکێ

قوتار: دەرباز، نەجات

قوتب: جەمسەر، سەرمەشق، دەستەواژەیەکە بۆ پیر و مەولاناش بەکاردێ

قووت: بژێوی ژیان، خۆراك

قوڵپی گریان: هەنسکی گریان

قوڵنگ: تەور، پاچ

قیت: ڕێك، شیك، ڕاوەستاو

**ك** –

کاڕك: میوەیەك هێشتا بەباشی نەگەیيبێت

کاریتە: ئەو دارە لووس و ڕێکەی دەیبڕنەوە و بەسەر بانی خانوو رایدەنێن

کاس: وڕ، گێژ

کالان: کیفی خەنجەر و شمشێر

کامی دڵ: بەئارەزووی دڵ، پڕ بەدڵ

کەد: قەد، لك

کەڕوو: ئەو تۆزە شین و سەوزەی کە نان دوای تێکچوون هەڵیئەدا، وەك بەڵغ گرتنی شت

کەپەن: تاتی، لە خوری مەڕ دروست دەکرێ و شوان لەبەر سەرما دەبەر خۆی دەکاو لەکاتی لە هەوێز خەوتنا دەچێتە ناوی

کەشکەڵان: شوێنی زۆر بەرز لە ئاسمان کە دەستی مرۆ پێی ڕانەگا

کەڵ: نێریەکێوی

کەل: ئەو بستو زینوو و بەرزاییەی کە خۆری لێوە هەڵدێ

کەلاك: کەلەش، لاکی مرداربوو

کەنەفتە: هێز لەبەر دابڕاو، داوەشاو، داهێزراو

کپ: خامۆش

کرۆك: جەوهەر، ناخ، ناوەڕۆك

کرووك: گوڵە کێویلەی خۆڕسکی سەرەتای بەهار

کۆز: ئەو حەوشەیەی بە تانۆك دروست دەکرێ بۆ تێکردنی کار و بەرخۆڵە

کۆسە: نێرینەیەك کە موو لە ریش و سمێڵی نەهاتبێ

کۆست: کارەسات

کۆك: شۆخ، جوان، قەشەنگ

کوڵینگ: ئەو کون و دەرچەیەی رۆشنایی لێ دێتە ژووری، بچووکترە لە قەپەنگ

کێم: زوخاو

کینە: رق و قینە

کێل: قووچ

کێوی: گیانەوری لە کێو و چیا بژی و ماڵی و دەستەمۆ نەکرابێ

گ –

گارە نەدراو: دەرگای گاڵە نەدراو، دانەخراو، قوفڵ نەکراو

گاگۆڵێ: رۆیشتنی منداڵی ساوا بە دەست و مەچەك و پێیەکانی

گاجووت: ئەو گایەی کە بەهێزەو جووتی پێ دەکرێ

گەروو: هەوك، قورگ، بە ملیش دەگوترێ: لە ملان ئاوابوو

گەز: گەستن، قەپاڵ لێگرتن

گەلحۆ: گێل، نەزان و بێکەڵك

گەییە: گەیشتە

گلاو: ئاوەگر

گولیی: نەخۆشی خۆرە کە نەخۆشیەکی پیسە

گوشاد: بەرینو کراوە

گومبەز: گومبەتی مزگەوت یان هی سەر گۆڕی پیاوچاکان

گوڵمێخ: ئەو بزمار یان سینگەی کە لە دیواردا دەکوترێ و شتومەکی پێوە هەڵدەواسرێ

گمەگم: دەنگی کۆتر

گرێوەغار: غاردانی خێرا، یەکبێن غاردان

گوێزی کوێرك: ئەو گوێزەی کە کاکڵەی پووچە

**ل –**

لاف و گەزاف: دەعیە و کەشخەلێدان، پۆزلێدان

لە پای: لە هەمبەر، لە سای

لەتاو: لە هەژمەت

لەتوێی خاك: لە ناو خاكدا

لە حەنا: لە ئاست

لە دارەتی دونیا: ئەو شتەی لە دونیادا شك بكا هەیبێ

لە قەبەڵی نا: لە خزمەت ئەوی دانا، لە پارسەنگی نا

لەکرۆکدا: لە بنەچەدا

لۆمە: گلەیی

لینگ: قاچ

**م -**

**ماتانێ: کەلایەنێ، هەڵماتێن، یارییەکە بە هەڵمات دەکرێ**

**ماك: ماددە، ئەسڵ**

**مەتەرێز: سەنگەر**

**مەحوو: سڕاوە، رەش بووەوە**

**مەڕاق: خولیا، سەرسامی**

**مەرام: نیاز، مەبەست**

**مەرایی: دووڕوویی، ریایی، کلکەسووتێ**

**مەرهەمەت: بەزەیی و سۆز**

**مەردووم: خەڵك**

**مەرگەمووش: ژەهر**

**مەیبوغزێنە: رقی لێ هەڵمەگرە**

**مەیسەر: جێبەجێ**

**متوو: هۆگر**

**مشتێك: پڕ بەدەستێك، چەنگێك، بە کەمێکیش دێ لە زۆر (وەك نموونە)**

**مشە: زۆر، لەبڕان نەهاتوو**

**مۆرانە: مۆرکە، خورانی ناوکی دار و درەخت**

**مۆن: رووگرژ، توورە و تووش**

**میلی تفەنگ: ئەو بەشەی کە فیشەکی پێ رەپێش دەنرێ بۆ تەقاندن**

**مینا: وەك، چەشنی، هاوشێوە. بەبەشی رەقی ددانیش دەگوترێ**

**ن —**

**نابەڵەد: ناشارەزا**

**نابوود: لات و رەجاڵ**

**ناسۆر: برینێکی پیسی تیراوی**

**ناماقووڵی: بێڕێزی**

**نەتدی: نەتبینی**

**نەدار: هەژار**

**نەدیتکە: نەدی و بدی**

**نە گەنێ: نەڕزێ، بۆگەن نەبێت**

**نەوسن: زۆر خۆری حەز لە هەموو شت**

**نەنگی: شوورەیی، عەیبە**

**نەوی: نزم**

**نەی: نای، بلوێر**

نسیٚ: سێبەر

نقێم: ئەو مۆرووەی سەر ئەنگوستیلە و گەردانە، کە لە ئەڵماس و دوڕ و مرواری یان لە بەردی گرانبەها دروست دەکریٚ

نواڵ: شوێنی نزم، شیو

نۆرە: نۆبەت، سرە

نووزە: کرووزانەوە لەگەڵ گریان

نووتەك: تاریکییەکی خەست، زۆر تاریك

نیر و ئاموور: ئەو دەستگایەی لە دار دروستکراوەو بۆ جووتکردن و کێڵانی زەوی دەخرێتە سەر ملی گاجووت

هـ -

هاوێنە: ئاوێنە

هایی: ئاگا

هەترە: هەڵبڕاو، دابڕاو

هەرگا: هەرکاتێك

هەڵەشەیی: هەڵەپاچی، ناڕێکی

هەڵدەوێزنیٚ: هەڵدەکردەوە

هەڵدێران: تێکەوتن، بەربوونەوە لە بەرزایی

**هەڵپەیانە: پەلەیانە**

**هەڵقرچان: سووتان لەبەر تینی گەرمایی**

**هەڵمات: کەلا**

**هەڵوەدا: عەودالْ**

**هەڵیقورتێنی: هەڵیچۆڕێنی**

**هەڵنگویْ: ساتمە ببا، بکەویْ**

**هەوێن: ئەو ماکەی کە ئەسڵە بۆ دروستکردنی ماددەیەکی نویْ**

**هەمدیس: هەمدیسان، ئەمجارەشیان، دیسان**

**هەنگلْ: پیل، بن هەنگلْ: بن پیل**

**هەنیە: نێوچەوان**

**هێش: ئێش، ئازار**

**هێشوو: وشی**

**هێور: لەسەرخۆ، ئارام**

**هەوی: مانگ**

**و -**

**وەحەوێی: بحەسێتەوە**

**وەحەسیْ: بحەسێتەوە**

**وەرکەوتبوو: خەوتبوو، پاڵکەوتبوو**

**وەژێر: وەبن، کەوتنەبن**

**وەلانێ: بخە ئەولاوە، دەستبەرداربە، واز لێبێنە**

**وێز: هەوێز، ئەو شوێنەی کە شەوان شوان مێگەلی تێدا ڕادەگرێ**

**ی –**

**یابە: دەستەواژەیەکە کورد بۆ عەرەب بەکاری دێنێ، وەک چۆن عەرەب کاکە بۆ کورد بەکاری دێنن.**